ئاراس فەریق زەینەڵ

# جەنگی دەروونی

## لە سەردەمی سەلاحەددینی ئەیوبییدا

ئاراس فەریق زەبنەڵ

# جەنگی دەروونی

## لە سەردەمی سەلاحەددینی ئەیوبییدا

(٥٦٧-٥٨٩ك/١١٧١-١١٩٣ز)

" لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی/دەروونیە"

بەهاری ٢٠٠٨

مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی.ن.ک)
سلێمانی - گەڕەکی سەرچنار - ١٢١
کۆلانی - ٤٤
ژ.خانوو - ١

www.hoshyari.org
govarynovin@yahoo.com

**ناوی کتێب:** جەنگی دەروونی لەسەردەمی سەلاحەددینی ئەیوبییدا

**نووسینی:** ئاراس فەریق زەینەڵ

**نەخشەسازیوبەرگ:** فەهمی جەلال

**تایپ:** محەمەد بابۆڵی

**چاپی یەکەم/** ۲۰۰۸ سلێمانی

**تیراژ:** (۱۰۰۰) دانە

**ژمارەی سپاردن:** (٥٤)ساڵی ۲۰۰۷

**ژمارەی زنجیرە:** (۲٥٦)

لەبلاوکراوەکانی مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی.ن.ك) ساڵی ۲۰۰۸

## سوپاس وپێزانین


- سوپاسی هەموو مامۆستاو هاوڕێ بەرێزەکانم دەکەم.
- سوپای هەموو ئەندامانی خێزانەکەم دەکەم.

# نیشانه و كورتكراوه‌كان

ت: توفي (ساڵی مردنی)

ل: لاپه‌ڕه

ج: جزء

مج: المجلد

هة: التاريخ الهجري ، ك: سالی كۆچی

م: التاريخ الميلادي ، ز: سالی زایینی

د.م : دون مكان الطبع

د.ت : دون تاريخ الطبع

س.پ: سه‌رچاوه‌ی پێشوو

هـ.س: هه‌مان سه‌رچاوه

ه.ن :هه‌مان نوسه‌ر

Vol: Volume
P:Page
PP:Pages

# پێرست

## پێشەکی:

جەنگی دەروونی بابەتێکی بایەخدارە و لە هەریەك لەزانستی دەروونیی کۆمەڵناسی وزانستی دەروونیی سەربازی، و گرنگی تایبەتی خۆی هەیە، چونکە دەگەڕێتەوە بۆلێکۆڵینەوە لە دەروونی مرۆڤ، زانا وفەیلەسوفەکان لەدێر زەمانەوە هەوڵیان داوە بگەنە قولایی ئەو دەروونە، بۆیە دەبینین چەندین تیۆر وتێڕامانی جیاواز هەیە لەسەر ڕەفتاری مرۆڤ، توانراوە چەند لایەنێك لەو ڕەفتارانە بخرێنە بەر چاو، چونکە مرۆڤ گیانلەبەرێکی ئاڵۆزە، و چەندین هۆکار کاردەکاتە سەر ڕەفتاری وڕەنگدانەوە وکاردانەوەی بەسەر ژیانیەوە هەیە، بۆیە دەبینین زۆر لە سەرکردە وفەرماندە سەربازییەکان گرنگی تەواو دەدەن بەجەنگی دەروونی، هەرچەندە وەکو ناو تازەیە، بەڵام وەکو پراکتیك کردنی کۆنە، کە لەناوەرۆکدا جیاوازی نیە لەگەڵ ئێستادا، تەنیا لەئامراز وجێبەجێکردندا نەبێت، بەپێچەوانەی جەنگی سەربازییە وبەبێ توندو تیژی مامەڵە دەکات، چونکە واتای جەنگ بەمانا تەقلیدیەکەی نییە، بەڵکو ئامرازێکی یارمەتیدەرە بۆ بەدیهێنانی ستراتیژیەتێکی سەرکەوتوو، چونکە زنجیرەی ئەو هەوڵەیە کەتەواوکەری کارە جەنگیەکانە، لەڕێگەی بەکارهێنانی ئامرازی پەیوەندی لەسەر بنەمای دەروونی بەئامرازی جیاواز بۆ کاریگەری خستنە سەر ڕای گشتی کە هەموزانا وبیریارەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کەبەشێکی سەرەکی وگرنگە لەڕەفتاری کۆمەلایەتی.

ئـەمڕۆ بـەهۆی پێـشکەوتنی جیهانـەوە لـەڕووی دەزگاکـانی ڕاگەیانـدن ومیدیاکانەوە دەیان ڕێگاو شێواز دەگرنە بەر بۆ بـەدیهێنانی ئامانجەکانیان وکاریگـەری کردنـە سـەر بەرامبـەر، ئەگـەر بێتـو ڕۆشـنبیری وهۆشـیاریەکی تەواو لای کۆمەڵێك یان سوپایەك یان گەلێك نەبێت، دوژمن زۆر بەئاسانی لە ڕێگـای جـەنگی دەروونیـەوە کـۆنترۆڵی بیرو هۆشیان دەکات وئامانجـەکانی خـۆی دەپێکێـت، چـونکە ئـەو جەنگـە چـەکێکی کوشـندەیە کـە وورە وهـزر ودەروونی مرۆڤ تێکدەشکێنێ بەشێوەیەك کار وچالاکی وخەبات وئاینـدەی لاوازدەکـات، بۆیـە ئـەو کەسـە لەڕاسـتی و ڕەوایـی کێـشەکانی تووشـی نائومێدی دەبێت.

دەتوانین بڵێین جەنگی دەروونی ئەو جەنگەیـە کەتێیـدا وشـە لـەبری چـەك وتۆپ وتفەنگ بەکاردێت بۆڕووخاندنی ورە وئیفلیج کردنـی توانـای دوژمـن. سەرکەوتنی ئەیوبییەکان لەسەردەمی سوڵتان سەلاحەددینی ئەیوبی لەبواری جـەنگی دەروونـی دەروازەیەکـە بـۆ سـەرکەوتنە سـەربازییەکان لەبـەرەکانی شەڕدا.

ئەو شەڕەش لەئەنجامی تێکچوون ولـێکترازان وململانـێ لـەنێو کۆمـەڵگای ئیسلامی بەرپابوو، کەببوە هۆی داگیرکردنـی خـاچ دروشمەکان بـۆ ناوچـەی ڕۆژهـەڵات ودامەزرانـدنی چـەند میرنـشینێك لـەکۆتایی سـەدەی(٥) تـاوەکو (٧)ی کۆچی واتا کۆتایی سەدەی (١١) تاوەکو (١٣)ی زایینـی، بەمەبەستی نەهێـشتنی بـوونی سـەربازی وسیاسـی و ئـابوری وشارسـتانی موسـڵمانان، ڕاسـتی ئـەم بۆچـوونە، بـەردەوام بـوونی هەڵمـەتی خـاچ درووشمـەکان لەئەورووپاوە بۆ ڕۆژهـەڵات دەیسەلمێنێ بۆ جێبـەجێ کردنـی ئامانجـەکانیان بەهەموو ئامرازو شێوازەکان لەچوارچێوەی جـەنگی دەروونـی و پڕوپاگەنـدە بۆ پاساوهێنانەوەی و دروستی هەڵمەتەکانیان.

هۆكـاری هەڵبـژاردنی ئـەم بابەتـە (جـەنگی دەروونـی لەسـەردەمی سـەلاحەددینی ئـەیوبی دا ٥٦٧-٥٨٩ك/ ١١٧١-١١٩٣ز) بـۆ لێكۆڵینـەوە لەپێكهاتـەو لایەنـەكانی بەشـێوازێكی زانـستیانە لەسـەرەتای دەركـەوتنی سوڵتان سەلاحەددین ودامەزراندنی دەوڵەتی ئەیوبی تاوەكو ڕێكەوتننامـەی (الرملـة) وكۆچـی دوایـی سـوڵتان، لەبەرئـەوە بـووە كـە تائێـستا توێژینـەوە لەلایەنی دەروونی وڕاگەیاندن لەو سەردەمەدا نەكراوە.

ئەمـەو جگـە لـەگرنگی ئـەم قۆناغـە لـەژیانی موسـڵمانان كـەببوە بنـەما سـەرەكیەكانی كۆمـەڵگای ئیسلامی لەڕۆژهـەلاتی ناوەڕاسـت، هـەروەها ئـەو قۆناغەیە كە تیایدا سوڵتان سەلاحەددینی ئەیوبی سـەركەوت بەسـەر هـەموو نەیار ودوژمنەكانی، گەیشتە ئەو ڕادەیـەی كەئەوروپاییەكان دانـی پیابنێن، هـەر ئـەو قۆناغـەش بـوو كەبـەهێزی ئەیوبیـەكانی وخۆشەویـستیان بـۆ سـەلاحەددین وپابەنـدبوونیان پێیـەوە وخۆڕاگرتنیـان بەرامبـەر هـەموو هەڕەشەیەك دەركەوت، هەروەها ئەم قۆناغـەش لەمێژووی دەوڵـەتی ئـەیوبی بەشـی خـۆی وەرگرتـووە لـە لێكۆڵینـەوە وتـەنیا ئـەوەی كـەزۆر ڕۆشـنایی نەخرابێتـە سـەر لەڕوانگـەی دەروونـی وڕاگەیانـدن لـەبواری جـەنگی دەروونییەوەیە، كاریگەری ئەم جەنگە لەووشیار كردنـەوەی موسڵمانان بۆ ڕووبـەڕوو بونـەوەی مەترسـی خـاچ دروشمـەكان وهانـدانی موسـڵمانان بـۆ جیهاد لەپێناوی خودا لەمیانەی وریاكردنەوە یان بەئاگاهێنانیان لە سایەی ئەو بارودۆخـەی كـە كۆمـەڵگای ئیسلامی بەدەستیەوە دەینالاند، بێگومان سوڵتان سەلاحەددین لەمیانەی ئەو ڕووداوانە بۆی دەركـەوت تـەنیا بەیـەك خستن ویەكڕیزی بەرەی ئیسلامی دەتوانێت خاچ دروشمـەكان لەڕۆژهـەلات دەربكات.

ئـەم بابەتـە گرنگـی لەوەدایـە کـە هـیچ کـام لـە لێکۆڵـەرەوەکان باسـیان لێنـەکردووە، سـەرەڕای کـەمی سەرچـاوە بەشـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ یـان ناڕاسـتەوخۆ لەسـەر جـەنگی دەروونـی وڕاگەیانـدن لەسـەردەمی سـوڵتان سەلاحەددین، لەکاتی کۆکردنـەوەی سەرچاوەو ئامادەکردنی بابەتەکەدا بـۆ لێکۆڵینـەوە چـەندین ئاسـتەنگ لـەم ڕێیـەدا رووبـەڕوومان بوونـەوە. لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە خـودی بابەتەکـەش بۆخـۆی بابـەتێکی ئـاڵۆزە، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا هەوڵمانـداوە کـە پلانێکـی مـۆدێرن بـۆ ئـەم باسـە دابنـێین و لـەو سەردەمە پراکتیکی بکەین.

ئەم توێژینەوەیە لەپێنج بەشی سەرەکی پێکهاتووە:

بەشی یەکـەم:- بریتیـە لەپێناسـە وچەمکی جـەنگی دەروونـی و پراکتیك کردنـی لەسـەردەمی سـوڵتان سـەلاحەددینی ئـەیوبی بەشـێوەیەکی کـورت و گەڕانەوەی خوێنەر لە هەندێ شوێن بۆ بەشەکانی تری توێژینەوەکە.

بەشـی دووەم:- تایبەتـە بـە جـەنگی دەروونیـی سـتراتیژی درێژخایـەن لەلایەن سوڵتان سەلاحەددین پرۆسەو چالاکییەکانی لە ڕزگارکردنی جیهانی ئیـسلامی و کـۆنترۆڵکردنی بارودۆخەکـە بەلایـەنی دەوڵەتـە تـازە دامەزراوەکەی، و جێبەجێ کردنی ئامانجە دەروونییەکان.

بەشـی سـێیەم:- تایبەتـە بەجـەنگی دەروونیـی تـەکتیکی کـورت خایـەن لەکاتی شەڕو ئاشتیدا لە مەیدانی سەربازی و شانۆی سیاسی بەمەبەستی ڕوخانـدنی ورەی خـاچ دروشمـەکان بەچـەندین شـێوازو هۆکـار، هـەروەها وەڵامدانەوەی خاچ دروشمەکان بەجەنگی دەروونی بەرامبەر.

بەشـی چـوارەم:-بریتیـە لەڕاگەیانـدنی دەروونـی و ڕۆڵـی سـوڵتان لـە بەئاگاهێنانەوەی موسڵمانان لـە مەترسـی خـاچ دروشمـەکان و هاندانیان بـۆ جیهـاد، ئەمـەو جگـە لـە ڕۆڵـی فەرمانـدەو نوسـەرو شـاعیرو گوتاربێـژەکان و

خۆئامـادەکردن بـۆ هەڵمـەتی سـێیەمی خـاج دروشمـەکان لـەپاش شـەڕی (حطـین)و ڕزگـارکردنی (بیـت المقـدس) بەدەسـتی موسـڵمانان، هـەروەها وەڵامدانەوەی خاچ دروشمەکان بە شێوازی دەروونی تایبەت بە خۆیان دژی موسڵمانان.

بەشی پێنجەم: لە سێ باس پێکهاتووە.

باسی یەکەم: تایبەتە بەجەنگی دەروونـی بەهێزکراو کە سوڵتان لەپاش وەرگرتنـی دەسـەڵات لـە وڵاتـی مـصر و کـۆنتڕۆڵکردنی جیهـانی ئیـسلامی ئامانجە دەرونییـەکانی پێکـا، هـەروەها ئاڕاسـتە کردنـی ئـەم جەنگـە لـەپاش چوونە ناو شاری قودس.

باسـی دووەم: بـاس لـە جـەنگی دەروونــی بـەرگری کـراوە لای سـوڵتان سەلاحەددین بۆ بەرگری کردن لە دەوڵەتی ئەیوبی دژی خاچ دروشمەکان.

باسی سێیەم: تایبەتە بە جەنگی دەروونی هێرشبەر لای سوڵتان بۆ سەر خاچ دروشمەکان لەکاتی شەڕەکان لە پێناو ئاراستەکردنی شێوازێکی تر لە جەنگی دەروونی.

لەکۆتایی دا ئەنجام هاتووە کە لەدرێژەی توێژینەوەکەدا پێیگەیشتووین.

## شیکردنەوەی سەرچاوەکان

لەڕاستیدا تێبینی ئەوە دەکرێ کە هەندێ لە سەرچاوە کۆنەکانی هاوسەردەمی شەڕی خاچ دروشمەکان، تەنیا گرنگیان بەلایەنی جەنگی وسیاسی داوە، بێ گرنگی دان بەلایەنەکانی تری وەك جەنگی دەروونی وڕاگەیاندن وپڕوپاگەندە، ئەویش بۆ تێڕوانین و بۆچوونی مێژوونوسەکان دەگەڕێتەوە لە بەرامبەر خاچ دروشمەکان، کە وەکو داگیرکار سەیریان کردوون، ئەمە جگە لەگێڕانەوەی ڕووداوە مێژووییەکان، کە باس لەڕۆڵی سەرکردە ئیسلامیەکان دەکەن، کە ببوە هۆی سەرهەڵدانی کۆمەڵێك سەرچاوە لەو سەردەمەدا. بۆ ئەنجامدانی ئەم توێژینەوەیە سوود لە گەڵێك سەرچاوەی ڕەسەنی ئەو سەردەمە وەرگیراوە، سەرەڕای ژمارەیەکی زۆر لە (مراجع)ی مێژوویی ودەروونی وسیاسی وسەربازی و ...هتد. لە گرنگترینیان کە بەپێی مردنیان ریزبەند کراون:-

١- ولیم الصوري: (م٥٨١ك/١١٨٤ز).

کتێبەکەی بەناوی (الحروب الصليبية) لە چوار بەرگدا خۆی دەبینێتەوە، دەتوانین بڵێن ئەم سەرچاوە تەواوترین سەرچاوەی ئەوروپیەکانە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، کە بە دەستمان گەیشتووە، یەکەم سەرچاوەی باوەڕپێکراوە لەشەڕی خاچ درووشمەکان لە نێوان سالانی (٥٤٠ك/١١٤٢ز- ٥٨٠ك/١١٨٤ز)، هەروەها کاریگەری ڕۆشنبیری ئەم مێژوونوسە لەسەر نوسینەکانی دیارە، سوودمان لەهەندێ بۆچوونی گرنگی وەرگرتووە لە توێژینەوەکە، بەتایبەتی لەبەشی دووەمو پێنجەم.

٢- القاضي الفاضل- (عبد الرحيم بن على بن محمد بن الحسن البيسانى اللخمي العسقلانى)، (م٥٩٦ك/١٢٠٠ن).

سەرەڕای ئەوەی (القاضی الفاضل) هیچ کتێبێکی لەبواری مێژوو سەردەمی سوڵتان سەلاحەددین بەجێ نەهێشتووە، بەلاَم بەگرنگترین شایەتی ئەوسەردەمە دەژمێردرێت ئەو شایەتیە بەدوو شێواز پێمان گەیشتووە، ئەویش:

ئەونامە مەزنانەی کە لەدوای خۆی بەجێی هێشتووە، جا نامەی خۆی یا هی سوڵتان، و ئەم جۆرە نامانە زۆربەنرخ و بە بەهان، وەکو بەڵگەیەکی مێژوویی بۆ ئەوسەردەمە، کەلەبەشی چوارەمی توێژینەوەکە سوودمان لێوەرگرتووە.

ڕۆژژمێری ڕۆژانەی (القاضی الفاضل) کەلەسەردەمی سوڵتان سەلاحەددین تۆماری کردووە وناسرا بە "المتجددات" یان "المیاومات" کەبریتی بوو لەڕووداوەکانی ڕۆژانە و (العماد الکاتب، ابو شامة، النویري، المقریزی) بەشێکیان لیَوەرگرتووە. ئەوەی کە لێوەشاوەیی (القاضی الفاضل) دەردەخات زۆری بابەتەکانی هیچ دەستەواژەیەکی دووبارە نەکردۆتەوەو کە بەکاری هێنابێ و هیچ نزایەکی دووبارە نەکردۆتەوە کە لە نووسراوەکانیدا کردبێتی و لەکاتی قسەدا هیچ وشەیەکی دووبارە نەدەکردەوە، بەڵکو هەموو وشەو دەستەواژەیەکی نوێی بەکار دەهێنا، لەبەشی چوارەمی توێژینەوەکە سوودمان لێوەرگرتووە.

٣-العماد الکاتب الاصفهاني: (م٥٩٧ك/١٢٠٠ن)" ابو عبدالله محمد بن صفیالدین محمد بن حامد، کتێبەکانی بەناوی:

(الفتح القسي في الفتح القدسي)ە، (البرق الشامي).

العماد الكاتب لە دوای مردنی سولتان سەلاحەددین سالی (٥٨٩ك/١١٩٣ز) نووسیویەتی کەباس لە فتوحاتی سەلاحەددین و خۆئامادەکردنی ئەیوبییەکان بۆ شەڕی (حطین) لەدژی خاچ دروشمەکان سالی (٥٨٣ك/١١٨٧ز) دەکات، سوودێکی زۆرم لەم سەرچاوەیە وەرگرتووە، چونکە (عمادالدین الکاتب) بەخۆی ڕووداوەکانی بینیوە یان "ڕۆژانەی جەنگ" وەکو بینەرێك دەگێڕێتەوە، کەتوانایەکی زۆرچاکی هەیە لەنیشان دانی وێنەی ڕاستی ڕووداوەکان کەگیان دەخاتە بەر جەستەی، وەکو پەیامنێرێکی جەنگی ڕووداوەکان سات بەسات دەگوێزێتەوە، سیستێمی (حولیات)ی بەکارهێناوە، باس لە لاوازی وبەهێزی سوپای ئەیوبی دەکات، وهەستی جەنگاوەرەکانی لەکاتی شەڕدا، باسی لەڕۆلی تیپە نهێنیەکانی (یزك) بەتایبەتی لەشەڕی حطین وڕزگارکردنی شارە کەنارییەکان وڕزگارکردنی شاری قودس لەکاتی هەلمەتی سێیەمی خاچ دروشمەکان و گەمارۆی شاری عکا دەکات. ئەمە جگە لەڕۆلی لەدیوانی (الإنشاء) ونوسینی مژدەبەخشەکان وشیعرەکان کە خۆی لەخۆیدا ڕۆلی ڕاگەیاندن وپڕوپاگەندەی دەرروونی بوو لەو سەردەمە، هەروەها باس کردنی (جنس) وپیادەکردنی لەلایەن خاچ دروشمەکان، واژۆکردنی پەیمانی ئاشتی کە لەنێوان سولتان وریچاردی شێردل بە (الرملة) ناونراوە.

البرق الشامی لە (٧) بەرگ پێك هاتووە، تەنها دوو بەرگی لە بەردەستمانە، ئەویش بەرگی (٣،٥) بەرگی سێیەم باس لە ڕووداوەکانی نێوان سالانی (٥٧٣-٥٧٥ك/١١٧٧-١١٨٠ز) ، بەلام بەرگی پێنجەم باس لە ڕووداوەکانی سالی (٥٧٨ك/١١٨٢ز) تا کۆتای سالی (٥٨٠ك/١١٨٤ز)، هاوکات دەتوانین جگە لەم دوو بەشە سوود لە کورتەی (البرق الشامی) بە ناوی (سنا البرق الشامی) هی (البنداری) وەربگرین کە باس لە ڕوداوەکانی

نێوان ساڵانی (٥٦٢ك-٥٨٣ك) لە بەشەکانی سێیەم و چوارەم و پێنجەم سوودمان لێوەرگرتوون.

٤- ابن شاهنشاه الايوبی: (م٦١٧ك/١٢٢٠ن) بە کتێبی (مضمار الحقائق وسر الخلائق) ناسراوە، یەکێکە لە سەرچاوەمێژووییەکانی دەوڵەتی ئەیوبی، لە بەشی سێیەم و پێنجەمدا بەکارمان هێناوە.

٥- یاقوت الحموی: شهاب الدین عبدالله. (م٦٢٦ك/١٢٢٨ن).

یەکێکە لەو جوگرافی ناسانەی زانیاری تەواو وچاکیان پێشکەش کردووە لە بواری جوگرافی وشوێنی شارەکان وهەرێمەکان لە وولاتی ئیسلامدا، بەرهەمەکەی زۆربە سوودە لەووردی وزانستی زانیاریەکان، بەگشتی زانیارییەکی زۆری داوە بۆناسینی شوێنەکان لەناوچەکەدا، لەهەموو بەشەکانی توێژینەوەکەدا سوودی لێبینراوە.

٦- إبن الاثیر:- أبو الحسن عزالدین علی بن الکرم محمد الجزری (م٦٣٠ك/١٢٣٢ن) کتێبەکەی بە ناوی (الکامل فی التاریخ).

چونکە باسی هەموو ڕووداوەکانی مێژووی ئیسلام دەکات، بەڵام ئەوەی کە پەیوەندی بە بابەتی ئێمەوە هەیە زۆرە.

(إبن الاثیر) زۆر بە دووروردرێژی باسی مێژووی سوڵتان سەلاحەددینی کردووە ، لە سەرەتای دەرچوونی لەگەڵ مامی (ئەسەددین شێرکوە) بۆ ولاتی مصر تاکۆتایی ژیانی، توێژەر لەدووتوێی شاکارەکەی (إبن الاثیر)دا دەتوانێت زانیاری زۆر بەنرخ وبەهای لێیهەڵبژێرێت بەتایبەتی لەکاری ڕامیاری و سەربازی وسیخوڕی ودەروونیدا.

تێبینی ئەوە دەکرێت لەو شاکارەدا (إبن الاثیر) نەیتوانیوە خۆی دەرباز بکات لەو بۆچوونانەی کە هەیبوو بەرامبەر سوڵتان سەلاحەددین، هاوکات

ئەم سەرچاوەیە یەکێکە لەسەرچاوە ڕەسەن وبنەڕەتیەکانی ئەو سەردەمە، بۆیە ئێمە لەم توێژینەوەیەدا زۆرسودمان لێی وەرگرتووە.

زانیاری لە (العماد الکاتب) وەرگرتوە، بەتایبەتی لە کتێبی "البرق الشامي"، ئەمەش بۆخۆی سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوە، شێوازی نووسینی سەرنج ڕاکێش وئاسان بوو، سیستەمی (حولیات)ی بەکارهێناوە لەگێڕانەوەی ڕووداوەکان کە بەڕۆژو مانگ وساڵ لەدوای یەك باسی دەکات، جگە لەوە هۆکاری کەوتنی شاری (عکا) دەگێڕێتەوە بۆ هۆکاری دەروونی.

ئەم سەرچاوەیە بۆخۆی تۆمارێکی گەورەیە بەهەموو کارەکانی سوڵتان سەلاحەددین وجولانەوەی سەربازی وسیاسی و، هۆی بەردەوامبوونی شەڕ لەگەڵ خاچ درووشمەکاندا، فاکتەرە پاڵنەرەکانی لەوەستانی شەڕو واژۆکردنی پەیمانی ئاشتی، وکەرەستە جەنگیەکانی نێوان هەردوولا، و بەکارهێنانی (سێکس) لەلایەنی خاچ دروشمەکان وەك شێوازێکی جەنگی دەروونیی تاکتیکی لەدژی سەربازە موسڵمانەکان کەلەبەشی سێیەم باسی لێوە کراوە.

٧ - إبن شداد: بهاء الدين أبو المحاسن يوسف بن رافع بن تميم(م ٦٣٢ك/ ١٢٣٤ز) ناوی کتێبەکەی (النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية) یا (سيرة صلاح الدين).

ئەم کتێبە دابەش دەبێت بەسەر دووبەشدا، یەکەمین لە ساڵی (٥٦٥ك/ ١١٦٩ز) دەست پێدەکات تاوەکو ساڵی (٥٨٤ك/ ١١٨٨ز) کە تایبەتە بەژیانی سەلاحەددین، بەڵام ئەو ڕووداوانەی کەلەساڵی (٥٨٤ك/١١٨٨ز) تۆماری کردووە تاوەکو کۆچی دوایی سوڵتان لە ساڵی (٥٨٩ك/ ١١٩٣ز)، گرنگی وبەهای مێژوویی خۆی هەیە، کە ناتوانرێت فەرامۆش بکرێت،

چـونکه بـەخۆی بینـەری ڕوداوەکـان بـووە لەوسـەردەمەدا، کـەمجار پـشتی دەبەست بەئەوانی تر، بۆیە ڕووداوەکانی بە دووروودرێژی تۆمار کردوە.

إبـن شـداد یەکێکـە لەمێژوونوسـە لێهاتووەکـان کـە ڕووداوەکـانی زۆر بەوردی وزانستی تۆمارکردووە، بەتایبەتی ڕووداوەکانی هەڵمەتی سێیەمی خـاچ دروشمـەکان لـەنێو سـالآنی (٥٨٥-٥٨٧ك/١١٨٩-١١٩١ن) کـە ئەورووپییەکان لەپاش کەوتنی قودس بەدەستی سولّتان سەلآحەددین لـە سالّی(٥٨٣ك/١١٨٧ن) ڕێکیان خست.

إبن شـداد زۆر نزیك بوو لەسولّتان سەلآحەددین کەلە زۆر شوێن باسی لەخۆشەویستی سولّتان بـۆ جیهادکردن لـەپێناوی خـودادا دەکـات، زۆر سـودمان لـەم سەرچـاوە ڕەسـەنە وەرگـرت، بەتایبـەتی لەکەسـایەتی سـەلآحەددین لـەڕووی سـەربازی وسیاسـی وجیهادییـەوە، هاوکـات ئامانجەکانی سولّتان لەکارەکانی، چونکە (ابن شداد) بەردەوام لەگەڵیدابوو، هـەروەها تایبەتمەنـدی نوسـینەکانی ڕاسـتگۆیی وبێلایـەنی تێـدا بـەدی دەکرێت، جگە لەدەقی وتارەکان وڕێکەوتننامەی (الرملة) لەگەڵ ڕیچاردی شێردڵ.

شـایانی باسـە گرنگـی ئـەم سەرچـاوەیە لەوەدایـە هەنـدێجار بـاس لەڕووداوێك دەکات کە سەرچاوەکانی تر باسیان نەکردووە یان زۆر بەکورتی باسیان کردووە، بۆ نموونە: ڕۆڵی تیپی یزك بۆ کاری سەرانسۆکردن، وتیپە دزەکـان، بۆیـە دەتـوانین بلّـێین ئـەم سەرچـاوە ڕەسـەنە زانیـاری گرنگـی دەربـارەی کارەکـانی سـولّتان لەلایـەنی سـەربازی وسیاسـی بەخـشیە توێژینەوەکە.

٨- ابن ابي طي- (م٦٣٢ك-١٢٣٤ن) (یحیی بن حامد أبو طی النجار بن ظافر بن علي بن عبدالله الغساني الحلبي)، (١٠) بەرهەمی هەبووە لەبوارە

جیاوازەکـان، بـەڵام دوو بەرهـەمی لـەبواری مێـژوودا هەیـە ئـەویش "معـادن الذهب في تـاريخ الملـوك والخلفاء وذوي الرتـب" و "كنز الموحدين في سيرة صلاح الدين" بەڵام هیچ لەو دووبەرهەمانـە بەدەستمان نەگەیشتووە، تـەنیا هەندێکی زۆربەکەمی ئەویش لای مێژوونوسانی دوای وەکو (ابو شامة، ابن الفـرات، المقريـزي)، لەڕاستیدا کتێبەکـەی لەسـەر سەڵاحەددین زۆر گـرنگ بـوو، ئـەویش لەمیانـەی کتێبـی ابـو شامة دەردەکەوێت، چوونکە زانیـاری زۆری تێدا بووە لەسەر مصر وحەلەب وئەفریقیا، وزۆربەی ئەو زانیاریانـەی لەباوکی وەرگرتووە، چونکە بینەری ڕووداوەکان بووە لەوسەردەمەدا.

٩- سبط ابن الجوزي-(م٦٥٤ك-١٢٥٦ز).

دانـەری کتێبـی (مـراة الزمـان في تـاريخ الاعيـان)، بـەرگی هەشتەم گرنگـی تایبـەتی خـۆی هەیـە، چـونکە زۆر گرنگـی داوە بەسیاسـەت وجـەنگ، لـەدووتوێی کتێبەکەیـدا باس لەزۆربـەی شـەڕەکانی نێـوان سـوپای ئـەیوبی وخـاچ دروشمـەکان دەکـات، گرنگـی ئـەم سەرچـاوەیە لـەوەدا دەردەکـەوێت کەدانەرەکـەی پـشتی بـە سەرچـاوەکانی سـەردەمی سـوڵتان سـەڵاحەددین بەستوە وەك "ابـن الاثـير، ابـن شـداد"بۆیـە بەیەکێك لەسەرچاوە گرنگـەکانی ئـەو سـەردەمە دادەنرێـت، لـە بەشـەکانی دووەم و سـێیەم سـوودمان لێوەرگرتووە.

١٠-أبـو شـامة: عبـد الـرحمن إسماعيـل بـن إبـراهيم المقدسـي الدمـشقي (م٦٦٥ك/١٢٦٦ز)، (الروضتين في أخبار الدولتين النورية والصلاحية).

یەکێکە لەسەرچاوە گرنگەکان، کە بابـەتێکی مێـژوویی گرنگـی پێـشکەش کـردووین، لەچـالاکی هـەواڵگری و تیپـە نهێنیـەکانی دەوڵـەتی ئـەیوبی، هـەروەها زۆر لەزانیاریـەکانی لـە کۆمـەڵێك مێژوونوسـی جێگـای

باوەڕوەرگرتووە لەوانە (العماد الكاتب والقاضي الفاضل وإبن الاثير وإبن شداد وإبن أبي طي).

بۆیە ئەم سەرچاوەیە لەڕووی ئەكادیمی و زانستی هیچی لەسەرچاوەكانی تری سەردەمی سوڵتان سەلاحەددین كەمتر نیە، لەدووتوێی ئەم كتێبەدا (ابو شامة) باس لەمێژووی دەوڵەتی ئەیوبی وولاتانی پەیوەندیدار دەكات، وەكو دەوڵەتی زەنگی یان خەلافەتی عەبباسی و هەڵوێستیان بەرامبەر میرنشینە خاچ دروشمەكان، هەروەها باسی ڕۆڵی بنەماڵەی ئەیوبی دەكات لەشەڕی خاچ دروشمەكان وسیاسەتی سەلاحەددین وپەیوەندی لەگەڵ خاچ دروشمەكان و خەلافەتی عەبباسی وبزوتنەوەی ئەراتقە وئیسماعیلیەكان، لەڕاستیدا ئێمە لەزۆربەی بەشەكاندا سوودمان لەم سەرچاوەیە وەرگرتووە هاوكات لەگەڵ دەقی نامەكانی سوڵتان كە لەو كتێبەدا هاتوون.

١١-إبن واصل: جمال الدين محمد بن سالم بن واصل الحموي(م٦٩٧ك/١٢٩٧ز)، لة كتێبەكەی (مفرج الكروب في اخبار بني ايوب).

پشتی بەستوە بە زانیاریەكانی (العماد الكاتب وابن الاثير وابن شداد، القاضي الفاضل)، لەهەمان كاتدا بابەتێكی نوێی خستۆتە ڕوو، هەروەها باس لەڕۆڵی سەلاحەددین دەكات لەدروستبونی بەرەی ئیسلامی یەكگرتوو جیهادكردن لەپێناوی خودا لەدژی خاچ دروشمەكان كەلەئەنجامدا توانی گەورەترین سەركەوتن بەدەست بهێنێت لەشەڕی حطین وڕزگاركردنی قودسدا، هاوكات ڕۆڵیان لە وولاتی (اليمن)، تەنیا جیاوازی نەكردووە لەنێوان ڕزگاركردن وفەتح كردن بۆ شارەكان، هەروەها باس لە گرنگی دانی

سولتان دەكات بەلايەنی شارستانیی وەكو دروستكردنی خوێندنگا ونەخۆشخانە وخانەقاە وقەڵاو شورا.

لەدووتوێی ئەم كتێبە ژمارەیەكی زۆر لەبەڵگەنامەی ڕەسمی بەدەستنووسی "العماد الكاتب وابن شداد والقلقشندی وابوشامة"وە تۆماركراوە.

إبن واصل جیا لەمێژوونوسانی سەردەمی خۆی شێوازێكی ڕوون وئاشكرای هەبووەو، زۆر لەدەقە مێژووییەكانی بەراورد كردووە، پاشان بەپێی بۆچوونی خۆی دەقە ڕاستەكانی وەرگرتووە، هەروەها باس لە هەواڵگری وسەرانسۆكردن و سیخوڕی لەپێناو كۆكردنەوەی زانیاری لەسەر خاچ دروشمەكان بە قازانجی سوپای ئەیوبی، هاوكات ئاماژە بەنامەكانی سولتان دەكات لەو سەردەمە، گرنگی (مفرج الكروب) لەوەدایە كە زۆربەی مێژوونوسانی دوای خۆی لەمیان وەرگرتوە وەكو : (الیونینی، ابو الفداء، النویري، الذهبی، ابن الفرات، المقریزي، ابن تغري البردي، العیني، النعیمي).

١٢-النویري: (م٧٣٣ك/١٣٣٢ز).

كتێبی (نهایة الأرب في فنون الادب) بەرگی (٢٨)، لەهەموو بەشەكانی ئەم توێژینەوەیەدا سودی لێوەرگیراوە، چونكە ئەم بەرگە تایبەتە بە سەردەمی سوڵتان سەلاحەددین كە هەموو ڕووداوەكانی تۆماركردووە.

١٣- القلقشندی: شهاب الدین ابو العباس احمد بن علي (م٨٢١ك/١٤١٨ز).

(صبح الاعشی في صناعة الانشا)، یەكێك لەسەرچاوە مێژووییە گرنگەكان، وەكو ئەنسكلۆپیدیایەك سەیر دەكرێت لەسەرجەم بوارەكان، كەباس لەسیستێمەكانی ئەو سەردەمە دەكات، وزانیاری گرنگی

بەخشیوەبەتوێژینەوەکە، تایبەتمەندی (القلقشندی) ووردی وزانستی وبابەتی لەسەرچاوەکەی بەدی دەکرێت، لە بەشی سێیەم.و چوارەم سودمان لێوەرگرتووە.

١٤- المقریزی: ابوالعباس تقی الدین احمد بن علی (م٨٤٥ك/١٤٤٢ز)

چەندین دانراوی هەیە وەکوو (السلوك لمعرفة دول الملوك) و (المواعظ والاعتبار بذکر الخطط و الاثار ) و(اتعاظ الحنفا باخبار الائمة الفاطمیین و الخلفاء).

توێژینەوەکە تاڕادەیەکی زۆر پشتی بە (السلوك) بەستووە، چونکە تایبەتە بەسەردەمی ئەیوبی، کەهەموو ڕوداوەکانی ئەو سەردەمەی بەووردی تۆمار کردوە، بەڵام (الخطط) سەرچاوەیەکی زۆرگرنگە و دەوڵەمەندە لە زانیاری دەربارەی وولاتی مصر، بێگومان لەکاتی کارکردن لەگەڵ ئەم سەرچاوانە بێلایەنی تێدا بەدی دەکرێت، هاوکات دوربووە لەتوند ڕەوی، ئەمەش گرنگی زیاتری بەخشیوەتە ئەم سەرچاوانە.

بۆ ئەم کارە زانستییە کۆمەڵێك سەرچاوەی نوێمان بەکارهێناوە کە بەشێوەیەکی گشتی سود لە بیر و بۆچونەکانیان وەرگیراوە، کە لێرەدا باس لە هەموویان ناکەین، چونکە لەلیستی سەرچاوەکاندا هەموویان تۆمار کراون.

## پێناسەو چەمکی جەنگی دەروونی

لەهزری توێژەران و نوسەراندا جەنگی دەروونی چەند ناوەرۆکێکی جیاوازی هەیە، ئەو جیاوازییە لەپێناسەکردنیدا کارێکی ئاساییە، ڕەنگە لەکاتی پێناسە کردنی جەنگی دەروونیدا درك بەو قورسیە بکەین کەڕووبەڕووی توێژەران دەبێتەوە بەهۆی ئەو کۆمەڵە زاراوانەوە کە بوون بە باو لەکاتی باسکردنی ململانێی ئایدیۆلۆژی لەجیهانی ئەمڕۆدا، لەو زاراوە بڵاوانە:

جەنگی سارد، جەنگی مینۆکی، جەنگی هزرەکان، جەنگی ئیرادە، جەنگی دەمار، جەنگی پڕوپاگەندە، جەنگی دەنگۆ، جەنگی دەروونی، جەنگی بیروڕا، جەنگی ڕامیاری، جەنگی مێشك، جەنگی ئایدیۆلۆژیا، جەنگی فێڵبازی، جەنگی سپی (سارد)، جەنگی سایکۆلۆژی، جەنگی ناتەقلیدی، جەنگی تایبەت، جەنگی وشەکان، جەنگی میدیا، دوژمنکاری ناڕاستەوخۆ، جەنگی خەبات لەپێناو دەستگرتن بەسەر هزرو ئیرادەی پیاوەکاندا[1].

زاراوەی جەنگی دەروونی بەستراوە بەجەنگی ڕاستەقینەی پراکتیکیەوە، بەڵام لەڕاستیدا سەر بەجەنگی ساردە کەلەپێش یان پاش جەنگی گەرم دەست پێدەکات، تەنانەت جەنگی سارد خۆی لەخۆیدا جەنگێکی دەروونیە[2]، لەوکاتەوە جەنگ بووەبە دیاردەیەك و توێژینەوەی لەسەر بکرێت، جەنگی دەروونیش وەك ئامرازێك لەخزمەتی جەنگدا خوێندرا، جەنگی دەروونی چەمکێکی نوێ نییە[3]، چونکە توێژینەوەی جەنگ بەڵگەیە

---

١ الكيلاني: الحرب النفسية بين الكلمة والطلقة، ل٤٧"نصر: الحرب النفسية،ج ١/ ل٩٨.

٢ الدباغ: الحرب النفسية، ل٤.

٣ قادر: حرب الافكار، ل٤٧.

بۆ ئەوەی جەنگی دەروونی تێدا بەکارهاتووە،و بەدەگمەن نەبێت هیچ جەنگێکیش نییە جەنگی دەروونی تێدا بەکار نەهاتبێت[4]، بەڵام مەسەلەی گرنگ کە دەکرێ لێی رابمێنین و هەڵوەستەیەکی بۆ بکەین، ئەوەیە کە چەمکی ناوبراو وەك هەموو چەمکەکانی تر لەمیانەی کاروانی مێژووی دوورو درێژی جەنگدا بە جۆرێك گەشەی کردووەو کە تەکنەلۆژیای نوێ لەئێستادا لەخزمەتیدایە،و گرێکانی زۆرکردووە، لەکاتێکدا کە ئامرازەکانی جەنگی دەروونی لەڕابردوودا سانا بووە، وەك هەر ئامرازێکی تری نوێی جەنگ، جەنگی دەروونی بەواتای ڕوخاندنی ورەی دوژمنە، لەڕاستیدا سەرکەوتن لەجەنگدا واتە سەرکەوتنی ئیرادەیەك بەسەر ئیرادەیەکی تردا[5]، بۆیە توێژەرەکان لەگۆشە نیگای گرنگیدان بەواقیعی ڕۆحیو دەروونی تاكو کۆمەڵگەوە گرنگییەکی تایبەت بەچەمکی جەنگی دەروونی دەدەن، لەبەر ئەوە لەسەرەتاوە وا پێناسەی جەنگی دەروونی کراوە کەبەکارهێنانێکی نەخشە بۆ کێشراوی ڕاگەیاندنو ئامرازەکانیەتی بۆچوونە ناو کاروبارە هزریەکانی دوژمنەوە، بەو ڕێگایانەی کە ئامانجە نەتەوەییەکان مسۆگەر دەکات[6]. سەرباری ئەوە کاریگەری هەیە لەسەر ورەی دوژمن بەو پێیەی کە ورە یەکێکە لەفاکتەرە گرنگەکانی سەرکەوتن، بەڵام جەنگی دەروونی بەبێ زانیاری تەواوو بەسوود دەربارەی دیارترین لایەنە مێژوویی و کۆمەڵایەتیو ڕامیاریو ئابووریو دەروونییەکانی میللەتو سوپای دوژمن هیچ بەهایەکی نامێنێ، هەروەها ئەو زانیاریانە هیچ سوودێکیان نابێت گەر بێتو ئەو کەسەی ئەو زانیاریانەی لایە نەزانێت بەچاکی هەڵیسەنگێنێت بۆ دانانی

---

٤ النوروزي: أهمية الحرب النفسية وجهة نظر اسلامية، مجلة التوحيد، عدد ٧٨، السنة الرابعة عشرة، تشرين الاول، ١٩٩٥. ل٨١.

٥ حمزة: أسس علم النفس الاجتماعي، ل٢٥٤.

٦ نصر: سەرچاوەی پێشوو، ج١/ ل٩٣.

بەرنامـەی جـەنگی دەروونیـ‌و ڕێکخستنی، چـونکە شیکردنەوەی ئامـانج لەجـەنگی دەروونیـدا زۆر گرنگـە[7]، بـەلام جـەنگی دەروونـی چـەمکێکە دامەزرانـدنی پەیوەنـدی نـە بەپێـشکەوتنی تەکنـەلۆژیای ڕاگەیانـدن و نـە بەبلاوبوونەوەی جێبەجێکردنی سیستمی نێو دەولەتی نوێوە هەیە، بەلکو دەگەڕێتـەوە بـۆ جەنگـەکان، ئـەویش کاتێـك هەنـدێك لەفەرمانـدەکان درکیـان کرد بەوەی کە کۆمەلێکی تر لەسەربازەکان دەترسن، هـەروەها سەربازەکانی دوژمن هەندێجار لە داکۆکیکردن لەشوێنەکانیان زۆر ئازان، بەلام هەندێکیان دەکشێنەوەو دەدۆڕێـن[8]، ئـەم دژوارییـە هەلچوون یـان گەڕانـەوە بـۆ هـۆکاری دەروونیـ‌و چـوون بـۆ لای پسپۆڕان بەمەبەستی توێژینـەوەو گەشـەدان بـە ئـامرازە بەهێزکـەرەکانی و لاواز کردنـی لـەلای دوژمـن، بۆیـە ئـەم ڕێوڕەسمـە پراکتیکیـەی ئـەم بـوارە لـەژێر ناونیـشانی جـەنگی دەروونـی زۆر لـە ئامرازەکانی گرتۆتەوە[9]، لە دوای ئەوە وا پێناسە کرا بەوەی کە هەلمەتێکی گـشتگیرە و هـەموو ئامرازەکـانی تیـا بـەکاردێت بـۆ کارکردنـە سـەر هـزری گروپێکـی دیـاریکراو بەمەبەسـتی ڕوخانـدنی هەلوێـستێکی دیـاریکراو،و دانانی هەلوێستی تـر لەجێیدا کـە ببێتـە ڕەفتارێك لەگـەل بەرژەوەندی ئەو لایەنەی هەلمەتەکەی دەست پێ کردووە بگونجێت[10]، لـەم چەمکەوە بۆمـان دەردەکـەوێت کـە جـەنگی دەروونـی و جێبـەجێکردنی لەمامەلـە کـردن لەگـەل هۆشـیاری مرۆییدا، ئـەو زانینـەی کـە ولاتـان هـەنگاوی فراوانیـان تێدا نـاوە لەبەکارهێنانیـدا بـەجۆرێك شـارەزابوون کەسـەرکەوتنی پێویـستی تێـدا بەدەست بهێنن، بـە بـەراوردێکی سـانا لەهەموو شـوێنێکی جیهاندا لـەنێوان

---

٧ الدباغ: علم النفس العسكري، ل١٦٠.

٨ العبيدي: الحرب النفسية في النظام الدولي، مجلة النبأ، العدد ٥٥، آذار ٢٠٠١م، ل٣٤.

٩ الدباغ: المرجع في الحرب النفسية، ل١٧.

١٠ نصر: س.پ، ج١/ ل١٠٦.

پێویستیەکانی جەنگی تەقلیدیو ئەتۆمی لەتێچوونی زۆرو پێویستی جەنگی دەروونی لەپارەو هەوڵی دیاریکراو، دەبینین تاکە تەرازووە کە پاڵ دەدات بەلای جەنگی دەروونیەوەو بە جیاوازیەکی زۆر گەورە، بۆیە چەکی دەروونی جیاوازە لەچەکە تەقلیدییەکانی تر بەوەی کە فرە ڕەهەندەو گۆڕاوە بەبەردەوامی دروست دەبێت بەپێی بارودۆخو هەلوێست، هەروەها بەرەو ئامانجێك دەڕوات کە ئاشکرا نەکراوەو ئاراستەکانی ناڕاستەوخۆن[11].

چەکێك ئەم هەموو خەسڵەتەی هەبێت دەبێتە خاوەن هێزێکی کاریگەر بەبێ بەرەنگاری کەسە مەبەستەکان یان بەبێ ڕێگری لەلایەن دەوروبەرەوە.

جێبەجێکردنی جەنگی دەروونی بەچەمکە نوێیەکەی کۆمەڵە چالاکیەکی بەربلاوە تێکەڵ بەیەكو تەواوکەری یەکترن[12]، بۆ نموونە کارە سیاسیەکانی دەرەوە لەهەندێ لایەنەوە پەیوەندیان هەیە بە گوتارو کۆنگرەو نامەو پەیوەندیەکان بۆ پێك هێنانی قەناعەتێك کە یارمەتی دەربێت بۆ هاندانی خۆشەویستی دۆستەکانو توند کردنی پەیوەندیەکانیانو ڕاکێشانی بێلایەنەکان بۆ ناو ئەو بازنەیە لەپێناو کەم کردنەوەی ڕێژەی دوژمنەکان، چونکە ئەمانە بەخشەری دەروونین[13].

هەروەها زۆر لە پراکتیکەکان ستەمە بخرێنە چوار چێوەی جەنگی دەروونیەوە، بۆیە دەبێت جەخت لەسەر ڕاستیەك بکرێتەوە ئەویش ئەوەیە جەنگی دەروونی کاتو شێوەی دیاریکراوە، هەر چەند کورت خایەن یان درێژ خایەن بێت لەگەڵ ئەوەشدا کەناو دەبرێت بەجەنگ، بەڵام جەنگی چەك نییە هاوکات کۆتایی نییە یان هەموو جارێ توندوتیژ نییە، لەوانەیە هەندێ جار نەرمو نیانو وریا بێت، بەڵام لەهەوڵو بەدوادا چووندا وریا

---

١١ الزبيدي: علم النفس العسكري، ل٢١٦.

١٢ ربيع: الحرب النفسية في الوطن العربي، ل١٠٩.

١٣ محمد: السياسة من وراء الستراتيجية، ل١٣.

بوونەوەیە بۆ گۆڕانێکی خێرا لە پلانێکی نەرم و نیانییەوە بۆ توندوتیژی یا لەتوندو تیژییەوە بۆ نەرم ونیانی[١٤].

ئاسان نییە بتوانین پێناسەیەکی دیاریکراو بۆ جەنگی دەروونی یان بوارەکانی دیاری بکەین، چونکە جەنگی دەروونی چەند چەمکێکی جیاوازو گۆڕاوی لەخۆگرتووە، لەبەر ئەوە نوسەران نەیانتوانیوە ئەم زاراوەیە لەچوارچێوەیەکی ئاشکرادا بخەنەڕوو، لەگەڵ ئەوەشدا چەندین پێناسە بۆ جەنگی دەروونی هەیە، بەلام هەر هەموویان لەخەسڵەتە زانستیە گشتیەکانیاندا کە دەروونناسەکان بۆیان دیاری کردوون یەك دەگرنەوە، جیاوازیەکەیش لە ئاراستەو وردەکاری و کارگێریەکەدا بۆ تێڕوانینە ئایدۆلۆژیەکان دەگەڕێتەوە[١٥]، بۆیە بۆچوون و تێڕوانینی دژ بەیەك لەنێو پسپۆڕانی ئەم بوارەدا هەبوو، هەروەها دەزگا جیاوازەکانی میدیاو ڕاگەیاندن و شێوازەکانی پڕوپاگەندە سەبارەت بەدیاریکردنی چەمکی جەنگی دەروونی نەگەیشتوونەتە هیچ ئەنجامێك بۆ دانانی پێناسەیەکی وردو گشتگیر بۆ جەنگی دەروونی[١٦]، ئەم جیاوازیەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی جەنگی دەروونی چالاکی و بوارو ئامرازەکانی دیاریکراو نییە.[١٧]

لێرەدا بەپێویستی دەزانین هەندێ لەو پێناسەو چەمکانەی جەنگی دەروونی بخەینە ڕوو، چونکە پێناسە لەبوارە جیاوازەکانی زانستدا گرنگە، لەبەر ئەوەی پێناسەکردنی شتێك واتە دیاریکردنی بواری کارکردن و ئامانج و ئامرازەکانی، هەروەها پێناسە کردن لە بواری زانستە کۆمەلایەتیەکاندا بەهۆی فرە جیاوازی لەبیرو بۆچوونەکانەوە گرفتێکە،

---

١٤ الدباغ: علم النفس العسكري، ل١٦٠.

١٥ هەمان سەرچاوە، ل١٥٨.

١٦ ربيع: س.پ، ل٢٣٢.

١٧ الدباغ: المرجع في الحرب النفسية، ل٤٨.

لێرەدا هەوڵ دەدەین هەموو ئەو پێناسانەی لەبەردەستماندان بیانخەینە ڕوو، ئەگەر چی بەوردی‌و شیکارییەوە بڕوانینە ئەو پێناسانە تا ڕادەیەك لەیەكەوە نزیكن.

هەندێ لە پسپۆڕەكانی پڕوپاگەندەو میدیاو ئەوانەی لە بواری جەنگی دەروونیدا كار دەكەن پێیان وایە جەنگی دەروونی بریتییە لەبەكار هێنانی پڕوپاگەندەو كارە ڕاگەیاندنەكانی تر، بەشێوەی پڕۆگرامێكی زانستی نەخشە بۆكێشراو لەلایەن وڵاتێك یان كۆمەڵە وڵاتێكەوە كە ئاراستەی دوژمن یان وڵاتانی بێلایەن یان دۆست‌و هاوپەیمانان دەكرێت، بەمەبەستی كاركردن لەڕاو بۆ چوون‌و سۆزو ئاراستەو هەڵس‌و كەوت‌و بیركردنەوەیان و گۆڕینیان بەجۆرێك كە خزمەتی سیاسەتی ئەو وڵاتانە، یان ئەو دەوڵەتانە بكات كە بەكاری دەهێنن تاكو ئامانجەكانیان بهێننەدی.[18] لەمیانەی ئەم پێناسەیەوە سوڵتان سەلاحەددین هەر لە سەرەتای وەرگرتنی دەسەلات لە وڵاتی مصر ساڵی (٥٦٧ك/١١٧١ز)[19] هەڵسا بە بەكارهێنانی پڕوپاگەندە و كارە ڕاگەیاندنەكانی تر بۆ ئەوەی بتوانێت راو سۆزی دانیشتوانی مصر و شام بەلای خۆیدا ڕاكێشێت لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجە دەروونیەكانی و پاڵپشتی سیاسەتی گشتی دەوڵەتە تازە دامەزراوەكەیدا.[20]

(لینبارجیر –Linebarger) یەكەم كەسە كە جەنگی دەروونی پێناسە كردووەو دەڵێ: بریتییە لەبەكارهێنانی پڕوپاگەندە لەدژی دوژمن لەگەڵ چەند ڕێوڕەسمێكی تردا كە سروشتێكی سەربازی‌و ئابووری‌و ڕامیاری

---

١٨ وەرگیراوە لە: عبد الله: الحرب النفسیة والشائعات، ل١١"نصر: س.پ، ج١/ل٩٢.

١٩ بۆ یەكسان كردنی ساڵانی كۆچی‌و زایینی پشتمان بەستووە بە كتێبی: ساڵانی كۆچی‌و زایینی، نوسینی أنطوان بشارة قیقانو، گۆڕینی محمود حاجی رحیم، چاپی دووەم، سلێمانی، ١٩٩٨.

٢٠ بڕوانە بەشی پێنجەم ئەم توێژینەوەیە، لاپەڕە ١٢٢.

پێویستە بۆ پڕوپاگەندە[٢١]، سولّتان سەلاحەددین ئەم جۆرە شێوازەی پیادەکردووە کە (لینبارجیر) باسی لێوە دەکات، ئەویش لە روی ئابوورییەوە وەك گەمارۆدانی شارەکان و ناچارکردنیان بە خۆ بەدەستوەدان، هاوکات تێکدانی کشتوکاڵ و دورینی دانەوێڵەکانیان، بەمەبەستی بێبەشکردنی خاچ دروشمەکان لە پێداویستیەکانی ژیان، هەروەها لە روی سەربازیەوە ئەنجامدانی مانۆڕی سەربازی بەر لە شەڕ.[٢٢]

بەلاّم پسپۆرەکانی جەنگی دەروونی وەك بەکارهێنانێکی نەخشە بۆکێشراوی دەبینن کە بەهاوکاری چەند ئامرازێکی تر جێبەجێ دەکرێت بەمەبەستی کاریگەری لەڕاو سۆزو هەڵوێستو ڕەفتاری گروپە دژەکان یان بێلایەن یان دۆستەکان بۆ پاڵپشتی کردنی سیاسەتو ئامانجە هەنوکەییەکان، یان پلانێکی سەربازی لەکاتی جەنگو قەیرانو ڕوو بەڕووبوونەوەکاندا ئەنجام دەدرێت[٢٣]. بۆ نمونە سولّتان سەلاحەددین بۆ جێبەجێکردنی ئامانجە دەروونیە ستراتیژیەکانی ، لە سەرەتای دروستبونی دەوڵەتی ئەیوبی جیهاد لە پێناوی خودا و کارکردن لە پێناوی رزگارکردنی قودسی راگەیاند. جەنگی دەروونی کاریگەری زیاترە لەسەر دوژمن وەك جەنگی ئاسایی، چونکە ئاراستەی مێشکی جەنگاوەر دەکرێ و مێشك و بیری ئیفلیج دەکات و ورەی دەڕوخێنێت،سولّتان سەلاّحەددین لە هەموو جەنگەکانیدا سیستمی جەنگی دەروونی پیادە دەکرد و ئەم شێوازەی بە پێی بەرنامەیەکی رێك و پێك و داڕێژراو لە دژی بێلایەنەکان و دوژمنەکانی

٢١ وەرگیراوە لە الزبیدي: علم النفس في المیدان العسکري، ل٧١.

٢٢ أبن شاهنشاه:مضمار الحقائق و سر الخلائق، ل٢٦" ابن شداد: النوادر السلطانیة، ل٧" ابو شامة: الروضتین في اخبار الدولتین النوریة و الصلاحیة، ج٢/ ل٨" ابن واصل: مفرج الکروب في اخبار بنی ایوب،ج٢/ل٨٠" النویري: نهایة الارب،ج٢٨/ ل٣٩٥" المقریزي: السلوك لمعرفة دول الملوك،ج١/ ل١٨٠.

٢٣ الکیالي: موسوعة السیاسة،ج ٢/ ل٢١٥" نصر: س.پ، ج١/ ل٩٣.

به گشتی و میره موسوڵمانەکان بەتایبەتی کە نەیاری بوون پەیڕەو دەکرد، ئەویش لە ڕێگەی گرنگیدان بە لایەنی دەروونی و ڕاکێشانی هەست و سۆزی جەماوەری موسوڵمانان نەك میرەکان.[24]

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کەجەنگی دەروونی تەنیا ئاراستەی دەوڵەتە دژەکان ناکرێت، بەڵکو دەوڵەتە دۆستو بێلایەنەکانیش دەگرێتەوە، ڕەنگە ئەمە وایکردبێت پسپۆرەکان وشەی (پڕوپاگەندە) لەبری (جەنگی دەروونی) بەکاربهێنن، لەڕاستیدا هەر دەوڵەتێك لە دەوڵەتانی جیهان کۆی ئەو سێ وەسفەی پێشوو ((دژو بێلایەنو دۆست)) دەگرێتەوە، ئەمە کاری پەیوەندییە نێو دەوڵەتیەکانە، چونکە ئەو دەوڵەتانە زۆر جار دۆستو دوژمنیان هەیەو هەندێ وڵاتیش لەڕووبەڕووی مەسەلەکاندا بێلایەن دەوەستن[25]، (مارك کلارك) سەبارەت بەجەنگی دەروونی دەڵێت: "هەر کارێك کە دوژمن ناچار دەکات پیاوەکانی بەچەكو تەقەمەنی لەبەرە چالاکەکاندا تەمویل بکات کەوای لێ دەکات پیاوەکانی سنوردار بکاتو لەحاڵەتی ئامادە باشیدابن بۆ ڕوو بەڕوو بونەوەی هێرشێك کە ناکرێت"[26].

هەندێ نوسەر جەنگی دەروونیان وا ناساندووە کە بەکارهێنانێکی ڕێكو پێکە بۆ چالاکییەکی دیاریکراو بۆ کار کردنە سەر ڕاو هەستو ڕەوشتو سۆزی کۆمەڵێ خەڵك لەکاتی شەڕدا یان لەپێش دەست پێکردنی شەڕ، بەمەبەستی لاواز کردنی وورەو گۆڕینی جۆری بیر کردنەوەی دوژمن لەمەڕ ئەو کێشەیەی کە شەڕی لەسەر دەکرێت بەجۆرێك ئەنجامەکان دژی بەرژەوەندییەکانی ئەو (دوژمن) ببنەوە[27]، ئەمەش مانای وایە

---

٢٤ حسن:تاريخ الاسلام،ج٤/ ل١٠٥" سعداوي: التاريخ الحربي المصري، ل٢٣.

٢٥ محمد: س.پ، ل٢٨-٢٩" الرضا: الرأي العام والأعلام والدعاية، ل٢٠٧.

٢٦ وەرگيراوە لە: نصر: س.پ، ج١/ ل٩٤.

٢٧ زهران: علم النفس الاجتماعي، ل٣٥٦.

کەبەکارهێنانی دەروونناسی لەشەڕدا ڕۆڵی گەورەی هەیە لەڕێگای پڕوپاگەندەو بڕینی پەیوەندی ئابووری‌و موناوەراتی ڕامیاری و بەکارهێنانی هێزی سەربازی تۆکمە، کە خزمەتێکی گەورەی شەڕ دەکەن[28].

گرنگی جەنگی دەروونی لەوە دایە کە ئیرادەی بەکارهێنەرەکەی بەسەر ئیرادەی دوژمندا بسەپێنێت، و بە شێوەیەکی نا سەربازی و ئابووری کارەکانی کۆنترۆل بکات،[29] بۆ نمونە لە کاتی رزگار کردنی شاری قودس لە لایەن سوڵتان سەلاحەددین لەساڵی (٥٨٣ك/١١٨٧ز)دا توانی لە ناو شاردا بە شێوەیەکی ناسەربازی جەنگی دەروونی بەهێزکراو ئاراستەی دانیشتوان بکات بە دەرکردنی بڕیاری لێخۆشبوونی گشتی، و بە ئامرازی ئابووری کارەکانی کۆنترۆل بکات، بە رێگای وەرگرتنی (رزگارانە = فدیە) [30]، بۆ ئەوەی ئیرادەی خۆی بە سەریاندا بسەپێنێت،[31]

جەنگی دەروونی لەچەکە نوێیەکانی جەنگە، ئاڕاستەی بیرو باوەڕو ئازایەتی دەکرێت، هەروەها شەڕێکی هێرش‌و بەرگری‌یە دژی حەزکردن لەشەڕ، چونکە بەکارهێنەرەکەی هەوڵدەدات ورەی سەربازەکانی‌و میللەتی

---

٢٨ عواد: الحرب النفسية وشائعات الحرب، ل١٤.

٢٩ نصر: س.پ، ج١/ ل٩٣.

٣٠ رزگارانە (فدیة): رێگایان بدات بە دەرچوون لە ماوەی چل رۆژ ، لە هەرپیاوێك هەژار بێت یان دەوڵەمەند(١٠)دینار و هەر ژنێکیش (٥)دینار، ومناڵ کوڕبێت یان کچ (٢)دینار بدات، هەرکەسێکیش نەیتوانی ئەمە بدات بکرێت بە دیل، بەلام سوڵتان سەلاحەددین لە بڕگەکانی ئەم پەیمانە لایدا و هەڵسوکەوتی لەگەڵ خاچ دروشمەکان کرد بە هەڵس و کەوتی بەزەیی و چاکە و دەست بەسەرداهێنان. بۆ ئەوەی نمونەیەکی باش و سەر مەشقێکی چاك لە لێخۆشبوون و دادوەری و لێبوردن، بە مەبەست و لە چوارچێوەی ئامانجە دەروونیە بەهێزکراوەکەی، بۆ ئەوەی سەرنجی دانیشتوانی شارەکە لە خاچ دروشمان بۆ لای خۆی رابکێشێت.(ابن شداد: س.پ، ل٩٣-دەڵێ منال یەك دینار-" ابن الاثير: الكامل في التاريخ، مج٧/ ل٣٣٥).

٣١ العماد الكاتب: الفتح القسي في الفتح القدسي، ل١٣٠" ابن الاثير: الكامل ، مج٧/ ل٣٣٥" ابن شداد: س.پ، ل٩٢" النويري: س.پ، ج٢٨/ ل٤٠٤.

خۆی پێ بەرزبکاتەوەو بەپێچەوانەشەوە هی دوژمن بڕوخێنێت[٣٢]،لە میانەی ئەم پێناسەیەدا لە کاتی هەڵمەتی خاچ دروشمەکان لە ساڵی (٥٦٩ك/١١٧٣ز) بۆ سەر شاری ئەسکەندەریە، لە سەرەتاوە سەرکەوتنیان بەدەستهێنا، بەڵام پاش بڵاوبوونەوەی هەواڵی هاتنی سوڵتان سەلاحەددین بۆ شارەکە، دانیشتوانی ورەیان بەرز ببووەوە بە هەموو توانایەکیان بەرگریان دەکرد،لە بەرامبەر دا کاتێك خاچ دروشمەکان ئەم هەواڵەیان بیست ورەیان روخا و لە ئەنجامدا شەڕەکەیان دۆڕاند و بە سەرکەوتنی سوڵتان و خەڵکی شاری ئەسکەندەریە کۆتایی هات.[٣٣]

ئەمە جگە لەوەی کە بریتییە لەبەکارهێنانی هەر ئامرازێك بەمەبەستی کارکردن لەگیانی مەعنەوی‌و لەسەر رەفتاری هەر گروپێك بەمەبەستێکی سەربازی دیاریکراو[٣٤]. هەروەها جەنگی دەروونی بەشێکە لەو جەنگە گشتگیریەی کە لەپێش جەنگ‌و لەکاتی جەنگ‌و لەپاش جەنگیشدا دەکرێت، هەروەها ناکەوێتە ژێر سانسۆری یاساو داب‌و نەریتی جەنگەوەو بەبنچینەی وەسفکردنی زەوی‌و سیستەمی جەنگ ناسڕدرێتەوە، چونکە پرۆسەیەکی بەردەوامە[٣٥]، بێبەش کردنی دوژمن لە پێداویستیە سەرەکیەکانی ژیان، وەکو بڕینی ئاو لە خەڵکی شەڕکەر و سوتاندنی شورا و دابەستنی (مەنجەنیق)[٣٦]بۆیان ، چەندین شێوازی دەروونی هەبوو، کە

---

٣٢ أمين: الحرب والمعنويات، ل١١٤" السلامة: الاستخبارات العسكرية في الاسلام،ل١٥٩.

٣٣ الصوري: الحروب الصليبية، ج٤/ ل١١٧" ابن الاثير: الكامل ، مج٧/ ل٢٥٠" ابن شداد: س.پ، ل٥٥-٥٦" ابو شامة: الروضتين، ج١/ ل٢٢٥" ابن واصل: س.پ، ج٢/ ل١٥"النويري: س.پ، ج٢٨/ ل٣٩٢.

٣٤ لاينبرجر: الحرب النفسية، ترجمة، حمير رشيد، ل٣.

٣٥ زهران: س.پ، ل٣٥٣" نصر: س.پ،ج ١/ ل١١٠.

٣٦ مەنجەنیق: ئامێرێکی ئاگرپەرژێنە ، ئەیوبیەکان لە شەڕی شارەکان بەکاریان هێناوە، یان کە پێی دەوترا شەڕی شورا و گەمارۆ، وە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا وەکو تۆپی قورس دەناسرێتەوە...بۆ زیاتر زانیاری

سولـتان سـەلاحەددین دژی خـاچ دروشمـەکان پیـادەی دەکـرد بەمەبەسـتی شکست پێ هێنانیان، ئەم شێوازەی زۆر بە سەرکەوتوویی جێبەجێ کرد، بەتایبەتی لە شەڕی (حطین) ساڵی (٥٨٣ك/١١٨٧ز) ئەویش پێش شەڕەکە هەسـتا بـە تێکـدانی هـەموو بـیر و کانیاوەکـانی ناوچـەکە تـاکو خـاچ دروشمەکان سودی لێوەرنەگرن، ئەمە لەلایەك[٣٧]. و لەلایەکی ترەوە لـەکاتی شەڕەکەدا فەرمانی سـوتاندنی هەموو گژوگیاکانی گۆڕەپانی شەڕەکەی دا، بـە شێوەیەك خـاچ دروشمـەکان هـیچ توانـای بەرگری تینـوێتی و گـەرماو شەڕکردنیان نـەبوو، و ئەنجامەکـەی بە شکستی گـەورەی خـاچ دروشمـەکان کۆتـایی پێهـات[٣٨]، بە شێوەیەك سـوڵتان بـەردەوام بـوو لـە جێبـەجێکردنی پرۆسەکەی کە رزگارکردنی شارە کەنارییەکان بـوو ، بە زەمینە رەخساندن بۆ گەیشتن بە ئامانجە گەورەکەی کە ئەویش رزگارکردنی شاری قـودس بـوو لە دەستی خاچ دروشمەکان.[٣٩]

ئاشـکرایە ئـیرادەی جـەنگو بـەرگریو خـۆڕاگرتن لەکارکردنـداو گیـانی ئەفراندنو داهێنان، هەروەها شکستو خۆبەدەستەوەدان، بێزارو نائومێدی هەمووی حاڵەتی عـەقڵین کە لـە بارودۆخێکی دیاریکراودا لـە هزری مرۆڤدا دروسـت دەبـن.[٤٠] ئـەم حاڵەتـە هزریە لای خـاچ دروشمـەکان دروسـت بـوو لـە پاش شەڕی (حطین)و بەتایبـەتی لـەپاش لەدەستدانی شـاری قـودس دۆخە

---

بروانە (الطرسوسی: تبصره ارباب الالباب فی کیفیه النجاه فی الحروب من الاسواء، تحقیق و نشر کلود کاهن، ل١٦-١٨).

٣٧ ابن الاثیر: الکامل ، مج٧/ ل٣٢٥" ابن شداد: س.پ، ل٨٦" ابو شامة: الروضتین، ج٢/ ل٨١" ابن واصل:س.پ، ج٢/ ل١٨٨.

٣٨ ابن الاثیر: الکامل، مج٧/ ل٣٢٥" ابن شداد: س.پ، ل٨٨.

٣٩ ابن شداد: س.پ، ل٩١" ابو شامة: الروضتین، ج٢/ ل٩٢-٩٤" ابن واصل: س.پ، ج٢/ ل٢١١.

٤٠ الدباغ: المرجع في الحرب النفسية، ل١٨٢.

دەروونیەکە هۆکارێکی پاڵنەر بوو کە بەهەموولایەك هەوڵیان دەدا چۆن شاری قودس رزگار بکەن لەدەستی موسوڵمانەکان، ئەو حاڵەتە وای لێکردن بیر لە هەڵمەتێکی نوێ بکەنەوە ئەویش هەڵمەتی سێیەمی خاچ دروشمەکان بوو.[٤١]

زۆر جار سەرکەوتنو شکست هێنان پاش چەند مانگێك یان چەند ساڵێك لەجێبەجێ کردنی دەردەکەوێت، لەگەڵ ئەوەشدا ڕەنگە سەرکەوتنێکی باش بەدەست بهێنێت ئەگەرچی پێوانە کردنی ئەستەمە بەلاّم گریمانەکانی شکستی کەمە لەگەڵ ئەوەی نادیارە، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا هەستی پێدەکرێت،[٤٢] لەمیانەی ئەم پێناسەیەدا کە ئەنجامەکانی جەنگی دەروونی پاش چەند مانگێك یاخود چەند ساڵێك دەردەکەوێت، سوڵتان سەلاّحەددین لە چوارچێوەی جەنگە دەروونیە ستراتیژیەکانی کە بۆ ئاسۆیەکی دوورمەودا کاردەکات لە یەکخستنی جیهانی ئیسلامی لە ژێر ئالاّی دەوڵەتی ئەیوبی بە بەرزکردنەوەی دروشمی جیهاد لەپێناوی خودا و رزگارکردنی قودس، کە ئەنجامەکەی کۆنترۆلکردنی جیهانی ئیسلامی و شەڕی (حطین)و رزگارکردنی شاری قودس لەدەستی خاچ دروشمەکان بوو،[٤٣] بەلاّم شکستی ئەم جۆرە جەنگە کەمە و نادیارە، لە هەمان کاتدا

---

٤١ بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە بەشی چوارەمی ئەم توێژینەوەیە، لاپەڕە (       ).

٤٢ لاینبرجر: س.پ، ل٣.

٤٣ ابن الاثير: الكامل ، مج٧/ ل٣٢٥" ابن شداد: س.پ، ل٨٥" ابو شامة: الروضتين، ج٢/ ل٨١" ابن واصل:س.پ، ج٢/ل١٨٨" النويري: س.پ، ج٢٨/ل٤٠٣.

**هەستیپێدەکرێت، بۆ نمونە لەدەستدانی شاری (عکا)[44] لە ساڵی (٥٨٧ك/١١٩١ز) کە بوو بە قوربانی شاری قودس.[45]**

**حامد ربیع پێی وایە جەنگی دەروونی ڕوخاندنی ورەی دوژمنە بەهەر شێوەیەك بێت بەمەبەستی لەناوبردنی هەر باوەڕ بەخۆ بوونێك کە ببێتە مایەی بەرهەڵستی و خۆبەدەستەوە نەدان[46]، سوڵتان سەلاحەددین ئەم شێوازەی لە کاتی گەمارۆدانی شارەکان پیادە دەکرد ئەویش تەنها مەبەست لە داگیر کردنی شارەکاندا ئەوەبوو کە سەربازەکان ببنە پاشکۆی ئەم و لەژێر ئالای جیهاد ئامادەبن و ئەوەی دەمێنێتەوە بۆ خەڵکی شارەکە بێت،[47] هەروەها هەرکاتێك بچوایەتە نێو قەلایەك یان شارێکی موسوڵمانی نەیاری خۆی، سەرەتا لە چوارچێوەی ئامانجە دەروونیەکانی لێبوردنێکی گشتی بۆ خەڵکەکەی دەردەکرد، ئەگەر حەزیشیان لە شەڕ و خوێن رشتن بووایە بڕیاری لەناوبردن و کوشتنیانی دەدا.[48]**

**مەبەست لێرەدا لاواز کردنی ورەیان و گۆڕینی شێوازی بیرکردنەوەیان بوو، بەشێوەیەك ئەو بەرژەوەندییانە بخولقێنێ کە ئەو ململانێیەی لەسەر دەکرێت، سەرباری ئەوە جۆرێکە لەجەنگی دەروونی کە ئاڕاستەی دوژمن دەکرێت بەمەبەستی لەناوبردنی بڕوا بەخۆبوونی و متمانە بەخۆ کردنی[49]، واتە لەهەوڵی قەناعەت پێکردن و قەناعەت کردندایە، هەروەها ئامانجی**

---

٤٤ (عکا) شارێکی کۆنە دەکەوێتە سەر کەناری دەریای ناوەراست، سەر بە (فلسطین)ە لە سەرووی حەیفا. ( ناصر خسرو: سفر نامە، ل٥٠-٥٢" یاقوت الحموی: معجم البلدان، مج٣/ ل٣٤٣-٣٤٤.

٤٥ ابن الاثیر: الكامل ، مج٧/ ل٣٨٥" ابن شداد: س.پ، ل٢١٦" ابو شامة: الروضتین، ج٢/ ل١٧٩" ابن واصل:س.پ، ج٢/ ل٣٥٥" النویری: س.پ، ج٢٨/ ل٤٣٢.

٤٦ الحرب النفسیة في الوطن العربي، ل٣٣.

٤٧ ابو شامة: الروضتین، ج٢/ ل٤٣.

٤٨ بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە بەشی سێیەمی ئەم توێژینەوەیە، لاپەڕە(    ).

٤٩ السلامة: س.پ.ل١٦٠"عبد الله: س.پ، ل١٢.

لەناوبردنی ئیرادەی تاکە، ئاکامی زۆر فراوانە، بەڵام سنووری کارکردنی دیاریکراوترە لە پڕوپاگەندە، چونکە زیاتر هەوڵی لەناو بردنی ئیرادە دەدات[٥٠].

جەنگی دەروونی کە دوژمن بەرپای دەکات کاریگەری نێگەتیڤی هەیە لەڕووخاندنو دامرکاندنەوەی بەرهەڵستکاری لەلای هاووڵاتیو جەنگاوەرو چاندنی تۆوی گومانو بێ متمانەیی لەفەرماندەکاندا بەمەبەستی بەدیهێنانی ئاکامەکانی، هەروەها ئامانجی کاریگەری بەجێهێشتنە لە دەروونی تاك دا بۆ ئەوەی لەو بۆچوونو ئامانجو پرەنسیپانەی کە باوەڕی پێیەتی لابداتو بۆچوونو پرەنسیپو ئامانجی تری تیا بچێنێو لە نەخشەکانی ژیانی دوور بخاتەوە[٥١]، بەمەش مەبەستی جۆرو تیۆرو باوەڕو ئامانجەکانی مرۆڤە، کە پانتاییەکەی فراوانتر دەبێت تا هەموو بوارەکانی ڕامیاریو ئابووریو سەربازیو کۆمەڵایەتیش دەگرێتەوە لەکاتی جەنگو ئاشتیدا، چونکە جەنگ لەڕێگەی چەکەوە دەتوانێت هێزو تەقەمەنی لەناو ببات، جەنگی ئابووری دوژمن لەپێداویستیە گرنگە زیندووەکانی بێبەش دەکات، بەڵام جەنگی دەروونی لەتوانایدایە شتی لەوە ترسناکتر ئەنجام بداتو کاریگەری زیاتری هەبێت، چونکە لە گرنگترین شت بۆ جەنگ کە ئیرادەیەتی بەتاڵی دەکاتەوە[٥٢]، مەبەست لێرەدا بیرکردنەوەو دڵی هاووڵاتیو سۆزیەتی بۆئەوەی گیانی ورەی لەناو بباتو بەرەو شکستی بەرێت.

لە میانەی ئەم پێناسەیەدا کە (جەنگی دەروونی) دوژمن بەرپای دەکات، ئەوەبوو خاچ دروشمەکان لە ماوەی گەمارۆدانی شاری (عکا)دا کە ماوەی دوو ساڵی خایاند لە (١٥ی ڕەجەبی ساڵی ٥٨٥ك/ ئابی ساڵی ١١٨٩ز تا

---

٥٠ ربيع: الحرب النفسية في المنطقة العربية، ل٣٧.

٥١ الموسوعة العسكرية: ج١/ ل٧٦٧.

٥٢ الحسني: الحرب النفسية وتأثيرها على معنوية الجماهير، ل٣٨٣.

١٧ی جمادی الاخیر ساڵی٥٨٧ك/ تەمموزی ساڵی ١١٩١ز)،[٥٣] توانیان جەنگێکی دەروونی تەکتیکی دژ بە سەربازان و خەڵکی شاری (عکا) ئاراستە بکەن.[٥٤]

(جمال السید) پێناسەی جەنگی دەروونی دەکات و دەڵێت: "بریتییە لەو شەڕەی بەهێزی ماددی یان مەعنەویە، و ئامانجی دوژمن دەخاتە بارودۆخێکی دەروونی خراپەوە کە باری شکستهێنانە"[٥٥]، سوڵتان سەلاحەددین ئەم شێوازەی لە دژی پیلانەکەی (مؤتمن الخلافة نجاح)[٥٦] پیادە کرد. کاتێك فەرمانی کوشتنی دا و شەڕی بەرپاکرد لە دژی سەربازەکانی سودان کە پشتگیریان دەکرد، بۆ ئەوەی بیانخاتە باری شکستەوەو چاوی ئەوانی تری پێ بشکێت و توانای دژایەتی و فەرمانڕەوایی سوڵتان سەلاحەددینیان نەبێت لە بەڕێوەبردنی دەوڵەتی ئەیوبیدا.[٥٧]

(فخري الدباغ) پێناسەی جەنگی دەروونی دەکات و دەڵێت: "بریتیە لە بەکارهێنانێکی ڕێك و پێك و نەخشە بۆ کێشراوی پڕوپاگەندەو جێبەجێ کردنیتر کە دەتوانێت کاریگەری لەسەر بۆچوون و ڕەفتارو بارودۆخی دوژمن هەبێت، یان گروپە دۆستەکان یان بێلایەنەکان، بەجۆرێك کە

---

٥٣ ابن الاثیر: الکامل ، مج٧/ ل٣٦٧" ابن واصل: س.پ، ج٢/ ل٢٩٤.

٥٤ بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە بەشی سێیەمی ئەم توێژینەوەیە، لاپەڕە ( ).

٥٥ أضواء علی الحرب النفسیة، ل١٥.

٥٦ (مؤتمن الخلافة نجاح) جوهر بن عبدالله: ئەمیندارو جێی باوەڕی خەلافەتی فاتمی بوو، هاوکات فەرماندەی فەرماندەییەکانی سەربازی خەلافەتی فاتمی بوو، جەوهەر پیاوێکی خەسێنراو بوو (ڕەنگە یەکێك بێت لە مەمالیکە ڕەش پێستەکان ئەگەر لەکۆشکی خەلیفە کاریان بکردبایە دەخەسێنران، واتە لە پیاوەتی دەخران) بەفەرمانی سوڵتان سەلاحەددین لەسێدارە درا، چونکە پەیوەندی لەگەڵ خاچ دروشمەکاندا بەستبوو لەکاتی پێشڕەوی کردنیان بۆ مصر. (أبوشامة: الروضتین، ج١/ ل١٧٨" أبن کثیر: البدایة والنهایة، ج١٢/ ل٣٤٤" القلقشندي: صبح الاعشی، ج٣/ ل٤٧٧.

٥٧ ابن الاثیر: الکامل ، مج٧/ ل٢٠٤" أبن تغري بردي: النجوم الزاهرة،ج٦/ ل١٧.

پاڵپشتی بەدیهێنانی ئامانج بێت"[58]، سوڵتان ئەم جۆرە شێوازەی لەکاتی گەمارۆدانی شارە موسوڵمانەکان پەیڕەو دەکرد، بەمەبەستی جێبەجێکردنی ئامانجە دەروونیەکانی، و بەدیهێنانی یەکخستنی هێزە ئیسلامیەکان و خۆ ئامادەکردن بۆ جیهاد لە دژی خاچ دروشمەکان.

هەروەها (میلوش مارکو) دەڵێت:"جەنگی دەروونی هەڵمەتێکی فراوانە کە هەموو جۆرە ئامێرو ئامرازێکی بەردەستی تیادا بەکاردێت بۆ کاریگەری خستنە سەر هزری گروپی دیاریکراو بەمەبەستی ڕووخاندنی هەڵوێستە دیاریکراوەکان و دانانی هەڵوێستێکی تر کە دەبێتە مایەی ڕەفتارێك، لەگەڵ بەرژەوەندی لایەنی شەڕکەردا بگونجێت[59]. ئەوەبوو لە ناو موسوڵمانان پیاوانی ئازاو چاونەترس هەبوو بۆ هێنانی یان دزینی خاچ دروشمەکان، بۆ نمونە سوڵتان سەلاحەددین تیپێکی گەورەی لەو موسوڵمانانە دروستکردبوو بۆ چوونە نێو ئۆردوگای خاچ دروشمەکان، بۆئەوەی ترس و دڵەڕاوکێ بخەنە نێو ریزەکانیان و ئیفلیج کردنی ورەیان و پەشیمان بونەوە لەو ئامانجەی کە لە پێناویداهاتبوون.[60]

(صلاح نصر) پێی وایە جەنگی دەروونی ڕەنگە داکۆکی کردن یان هێرش بردن بێت کەدەبێتە هۆی بەرزکردنەوەی ورەی جەنگاوەران و ڕوخاندنی ورەی دوژمن، جەنگی دەروونی دوورە لەپێ لێنان و نەریتی جەنگی تەقلیدی و ناچێتە خانەی سانسۆری یاسا[61]. جەنگی دەروونی بارێکی شەڕی چەکداری جەستەیی یان دەروونییە یا هەردووکیانە لەنێوان خەڵکانێك بەمەبەستی جێبەجێ کردنی ئامانجی دیاریکراو، بەرەو ژیانێکی

---

٥٨ الحرب النفسية، ل٣.

٥٩ الحرب النفسية، ترجمة لبيب لهيطة، ل٢١٤.

٦٠ ابن شداد: س.پ، ل١٩٦.

٦١ الحرب النفسية، ج١/ ل١١٠.

چارەنووسی بایەخدار بەڕێگای بەکارهێنانی توندوتیژی، ئەمەش یا دەیگەیەنێتە سەرکەوتن و خۆشنودی یان دەیخاتە چوارچێوەی ناوخۆیی و شکستەوە[٦٢]، لە شێوازەکانی سەلاحەددین بە تایبەتی لە هەڵمەتی کەشتیگەلی (صقلیە)[٦٣]، بۆ سەر شاری ئەسکەندەریە لە کۆتایی ساڵی (٥٦٩ك/١١٧٤ز)، هەروەها لە شەڕی (حطین) ساڵی (٥٨٣ك/١١٨٧ز)، هیچ ڕێگەیەکی بە دوژمنان نەدەدا تا رابکەن و جارێکی تر بەرەنگاربببنەوە، بۆیە سوارەکانی سەلاحەددین هەر لەگەڵ دەرکەوتنی سیمای سەرکەوتن چواردەوری گۆڕەپانی شەڕەکەیان دەدا و دوژمنەکانیان لەناودەبرد، هەر لەبەر ئەوەش دەبینین لە شەڕەکاندا خەڵکانێکی زۆر کوژراوە، کە زۆرجار دەگەیشتە دوو ئەوەندە و سێ ئەوەندەی سوپای موسوڵمانان، ئەم شێوازەی لەناوبردن هۆکارێك بوو لە هۆکارە دەروونییەکان بۆ تێکشکاندنی ئیرادەی جەنگ لای خاچ دروشمەکان، ئەمەش لە لایەکی تر پێویستیەکە بۆ نەهێشتنی هاوسەنگی هێزەکان کە هیچ کاتێك بەلای موسوڵماناندا نەشکاوەتەوە.

(فرید أیار) پێی وایە جەنگی دەروونی جۆرێکە لەجۆرەکانی فەرماندەیی جەنگ، چونکە بەیارمەتی چەند شێوازێکی وەك پڕوپاگەندەو مەترسی خستنە ناخی دەروونی بەرامبەر، دەتوانێ کاریگەری بکاتە سەر دەوڵەتە بێلایەنەکان بەمەبەستی ناچارکردنیان بۆ پەیڕەو کردنی بیروبۆچوونی شەڕکەران[٦٤]. (ئایزنهاور)[٦٥] دەڵێ چانسێکە بۆئەوەی سەرکەوتن بەبێ زیانی

---

٦٢ زناد:الحرب النفسیة، ل٩.

٦٣ (صقلیە): دورگەیەکە لەدورگەکانی دەریای (ناوەراست) بەرامبەر (تونس)، شێوەی سێگۆشەی هەیە، سەر بە ئیتالیایە. (یاقوت الحموی: س.پ، مج٣/ ل١٩٦-١٩٧).

٦٤ دراسات في الأعلام والحرب النفسیة، ل٧٣.

٦٥ (ئایزنهاوەر –Eisenhower) سەرۆکی سیو چوارەمی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە، فەرماندەی هاوپەیمانان بوو لەجەنگی دووەمی جیهانی (١٩٣٩-١٩٤٥)ز، لە ساڵی ١٩٣٤ز بەرپرسی

گیـانی بەدەسـتبهێنێت، هـەروەها لەخـەبات کـردن لـەپێناوی ئاشـتیدا سـەرکەوتن بەدەسـت بهێنێـت[٦٦]، بـەڵام ئینگلیزەکـان سـەبارەت بەجـەنگی دەروونـی دەڵـێن جـەنگێکی ڕامیاریـیـە، پرەنـسیپە دەروونـیو هـزریو کرداریـەکان تێیـدا، بـەکاردێن بۆیـە وای دەبیـنن کـە هـزرو دڵ دەبات، بـەڵام سۆڤێتیەکان پێیان وایە کە هەموو کارێکی ڕامیاریو دەروونییە و ئامانجی ڕووخاندنی ورەی دوژمن، و لاواز کردنی توانای شەڕکردنیەتی، پاڵنەرە بۆ چۆك پێدادانیو دەرچوونی لەجەنگەکە[٦٧].

بەڕای (أبن خلدون) سەرکەوتنی هەر لەشکرێك بەنـدە بـە دوو هـۆ: یەکـەم، بەهێزی سوپاکەو جۆری چەكو کارامـەیی بـەکارهێنانی، دووەم هـۆ بـەهۆی (شـاراوەیی)، کـە ئـەمڕۆ بەجـەنگی دەروونـی نـاودەبرێ. کەواتـە وەك پێغەمبەری ئیسلام(د.خ) ئـەڵێ "الحـرب خدعـة" واتـا "جـەنگ فێڵـە"[٦٨]، فێڵ ڕۆڵی خۆی ئـەبینێ لەسـەرکەوتندا، گومانی تێدا نییە دیاردەکانی جەنگی دەروونـی لـە شـەڕدا زۆر کاریگـەر بوون و شوێنەوارەکانی تـا ئێستاش هـەر ماونەتەوە، کە کاریگەریشی هەبووە لەسەر سیاسەت لەپشت بەستنی تـەواو بەجـەنگی ڕاسـتەوخۆ[٦٩]، یـان شـەڕی چـەکداری وەك هۆکـارێکی جـەنگی دەروونی، جەنگی گۆڕینی ڕەفتارە گۆڕەپانەکەیشی کـە سایەتیە. بەگشتی جەنگی دەروونی جەنگێکیساردە، جـەنگی ئایدیاکانـە مەبەسـتی گـەیشتنە بەهزری مرۆڤو شکست هێنان بە ئیرادەی[٧٠]، هەروەها جـەنگی ئایـدیۆلۆژیاو

---

داگیرکردنـی باکوری ئـەفریقیا بـوو، و تـوانی کێشەی کۆریـا چارەسـەر بکـات، و خـاوەنی پـڕۆژەی ئـایز نهاوەر. (الکیالي: موسوعة السیاسة، ج١/ ل٤٣٧).

٦٦ وەرگیراوە لە: نصر: س.پ، ج١/ ل٩٩.

٦٧ الدباغ: علم النفس العسکري، ل١٦٠.

٦٨ تاریخ أبن خلدون، ج١/ ل٤٩٠.

٦٩ قادر: س.پ، ل١٣.

٧٠ أد– لبر تش: الحرب الباردة وما بعدها، تعریب: فاضل زکي محمد، ل٣٥.

بیروباوەڕ، جەنگی دەمار، جەنگی پڕوپاگەندەو دەنگۆ، هاوکات جەنگێکە هزر دەلەرزێنێ و ڕەفتار دەگۆڕێت، باشترین چەکیشە کە دەوڵەتان لە جەنگە نوێیەکانیاندا بەکاری دێنن، چونکە ڕۆڵێکی ئەکتیڤ دەگێڕێت لە کوشتنی ئیرادە و ڕوخاندنی ورەی دوژمن بەمەبەستی چۆك پێدادانی[71]، سوڵتان سەلاحەددین هەوڵی دەدا بۆ بەهێزکردنی گیانی مەعنەوی لای سوپاکەی، و لەناوبردنی گیانی مەعنەوی لای دوژمن بۆئەوەی شکستیان پێ بهێنێ و خۆیان بە دەستەوە بدەن، لەو پێناوە چەندین شێوازی بەکارهێنا بۆ دەستەبەرکردنی ئەو ئامانجە، لەوانەش بە نێو سوپاکەی دەهات و دەڕۆیشت و دەیگوت:"وا اسلاماه– وای لە ئیسلام"،[72] ئەمەش بۆ خۆی کاریگەری دەروونی هەبوو لەسەر بەرزبوونەوەی و ورەی موسوڵمانان و روخاندنی و ورەی خاچ دروشمەکان و چاندنی ترس لەنێو دڵیاندا، ئەمە جگە لەوەی سوڵتان شێوازی لەناکاوو کتوپڕی لەکاتی شەڕدا بەکار دەهێنا لە پەلاماردانی دوژمن و دەوردانیان و دەست کردن، بە جەنگ لە کاتێکدا کە ئەوان هێشتا خۆیان بۆ ئامادە نەکردبوو.[73]

بێگومان جەنگی دەروونی چەکێکی ئەکتیڤە لەشەڕەکاندا، چونکە ئامرازێکە یارمەتی ئامرازەکانی تری جەنگ دەدات لە سەرکەوتندا، هەروەها زۆر لەزیانەکانی مرۆڤ لەچەك و تەقەمەنی و پارە دەگێڕێتەوە[74].

ئەوەی نوێیە لەجەنگی دەروونی دا پێشکەوتنی ئامرازەکانیەتی بەپێی یاسایەکی ڕێکخراوو نەخشە بۆ داڕێژراو، بەو پێیەی ژیانی سەربازی ژیانێکی کۆمەڵایەتییە لەجۆرێکی دیاریکراو دەتوانێت کردەوەکۆنترۆڵی

---

٧١ زهران: س.پ، ل٣٥٣"نصر: س.پ، ج١/ ل١٠٠.

٧٢ ابن شداد: س.پ،ل٤٢.

٧٣ نوفل: الحرب النفسية من منظور اسلامي، ل١٢١.

٧٤ الزبيدي: علم النفس في الميدان العسكري، ل٧٠.

بكات، كه ئەويش پێويستيەكی بنەڕەتييە لەهەموو ئەركە سەربازيەكاندا جا لەكاتی ئاشتی بێ يان لەكاتی جەنگدا[75]، چونكە ئەوانەی لە گۆڕەپانی جەنگی دەروونيدا كاردەكەن دەزانن چۆن لە ورەو دەروونی سوپاو ميللەتەكانی بەرامبەريانيدا توێژينەوە بكەن، چ لە ڕووی ئامادەكردن‌و ڕاهێنان‌و پڕ چەك كردنيان بێ، يان هەرشتێكی تر كە پەيوەندی بەبەهێز كردنی كەسێتيەوە هەبێت[76]. واتە دەكرێ ئەو خالانە دەستنيشان بكرێن كە دەتوانرێت لايەنی شەڕكەر لێيانەوەی تێپەڕێت‌و چەكەكانی جەنگی دەروونيان لێوە ئاراستە بكات.

لێرەوە دەتوانين بلێين جەنگی دەروونی بەپێی چەمكی ئێستای لەشيكردنەوەو بەڕێوەبردنی ململانێدا، ئەوانەی ئەنجامی دەدەن هەوڵ دەدەن بەرهەمهێنانی بەخشەر زياتر لەلايەكەوە كەهەر لايەنێك پێی هەڵدەستێت بۆ ئەوەی بۆ چوون‌و چەمك‌و تێڕوانين بسەلمێنێت كەوای لێ دەكات ئەو كارە دياری بكات‌و كارێكی تر نەكات، لەو ململانێيەدا هەر لايەنێك هەوڵدەدات شكست بەبەرامبەرەكەی بهێنێت لەڕووی پراكتيك‌و هزريەوە،و ئەگەر هاتوو لە توانايدا نەبوو ئەوا هەوڵ دەدات شەڕەنگێزی كەم بكاتەوەو بەرەو بێلايەنی بڕوات[77].

هەروەها هەر لايەنێك هەوڵ دەدات بێ لايەنەكانی دەرەوەی ململانێكە بكاتە دۆستی خۆی، بۆ ئەوەی لەداهاتوودا نەچنە بەرەی دوژمن، هاوكات لەگەڵ توندو تۆڵكردنی پەيوەندی دۆستايەتی بۆ ئەوەی لەداهاتوودا

---

٧٥ الزبيدي: الحرب النفسية ضد الأنظمة القيمية للامة، مجلة الوحدة، عدد ٢٥٤، سنة ٢٠٠١، ل٣١.

٧٦ الزبيدي: علم النفس في الميدان العسكري، ل٧٠.

٧٧ تايلور: قصب العقول، ترجمة :سامي الخشبه، عالم المعرفة، رقم ٢٥٦، الكويت، ٢٠٠٠، ل٢٤.

لایـەنگری خـۆی بـن، بـەم جـۆرە جـەنگی دەروونـی پرۆسـەیەکی بەردەوامـە تەنها پەیوەست نیيە بەقەیران‌و جەنگەکانەوە یا بەکات‌و شوێنەوە[78].

بەگشتی جەنگی دەروونی کارێکی فراوان‌و گشتگیرە بەچەند ڕێگەیـەکی جۆراوجۆر ئەنجام دەدرێت:-

أ/ ڕاستەوخۆ:

١-چـالاکی دیپلۆماسـی- ڕێکەوتننامـە، هاوپـەیمانی‌و دەسـتێوەردانی کاروباری ئەوانی ترو تەکەتولات (گەلەکۆمە)و دابڕان[79].

٢-کاری سەربازی- لەهێرشی بەرفراوان، لێدانی لەناوبەر، پێکدادانی سنووریی، نمایشی سەربازی، بۆردومانکردنی ئامانجی ستراتیژی، داگیرکردنی ناوچەی گرنگ، هەڕەشە لێکردن‌و کاری سەربازی.

ب/ ناڕاسـتەوخۆ (دەروونـی)[80]: کـە هـەردوو لایـەنی نهێنـی‌و ئاشـکرا دەگرێتەخۆ.

١-چالاکی ڕاگەیاندن بەمەبەستی هەڵگێڕانەوەی ڕاستی و بۆچوونەکان‌و گۆڕینی حەزو ئاڕاستەکان.

٢-کاری سیخوڕی بۆ کۆکردنەوەی زانیاری‌و پاڵپشت کردن‌و وروژاندنی ترس‌و نانەوەی دوو بەرەکی‌و ئاشوب.

٣-نمایش کردنی هێزو گۆڕینی ویژدانی هەندێ کەس، یان شیکردنەوەو تێکدانی دەروونـی‌و یـاری کـردن بەخـەون‌و هیواکانیـان‌و ئیـستغلال کردنـی هەستە مرۆییەکانیان‌و..... هتد٨١.

---

٧٨ أيار: س.پ، ل٧٢.

٧٩ الدباغ: الحرب النفسية، ل١٧-٢١.

٨٠ الدباغ: المرجع في الحرب النفسية، ل٥٠-٥١.

٨١ عزالدين: الحرب النفسية ضد الانظمة القيمية للامة، مجلة الوحدة، عدد ٢٥٤، تشرين الاول ٢٠٠١م، ل٣٢.

## جەنگی دەروونی ستراتیژی

ئەو جەنگە دەروونییەیە کە ئاراستەی هەموو ئەندامانی دوژمن دەکرێ، بە خەڵکی مەدەنی و سەربازەوە،و بەچەندین شێواز بەکار دەهێنرێت، ئەم شێوەیەی جەنگی دەروونی لەڕووی زەمەنەوە و لەپێناو پێکانی ئامانجەکانی بەدووربینی ناسراوە، واتە دوور ئامانجە بەکاتوشوێنی دیاریکراوەوە پەیوەست نیيە[1]، ئامانجی بەدەستهێنانی پەیوەندیکردنی جەماوەرییە کە ئاڕاستەی خەڵکانێکی زۆرو شوێنێکی فراوان دەکرێ، و مەبەستیش لێی کارکردن بۆ سەر ڕاو بۆچوونو ڕەفتار، لەدەرەوە مەبەستی بەدەستهێنانی ئامانجەکانی وڵاتە[2]، ئەم جەنگە ئاراستەی خەڵکانێك یان گەلێکی  دیاریکراو ناکرێ، بەڵکو هەوڵ دەدات بۆ بەدەست هێنانی ئامانجە ستراتیژییەکانی دەوڵەت کە بەپێی ئەو ئامانجە دەست نیشان کراوە[3]، ئەمەش گشتگیرەو لەوانەیە لەم جۆرە جەنگەدا گەلێك لەبنەماکانی جەنگ بەکاربهێنرێتو هەندێ جاریش جەنگی سەربازی (تقلیدی )یشی بۆ بەکاردێت کە بەتەواوی پابەندە بەئامانجی دەوڵەتەوە[4]. تایبەتمەندی شێوازە دەروونیەکانی سەلاحەددین کە ئەمڕۆ بە (ستراتیژیەت) دەناسرێت چ لەبواری ململانێی ڕامیاری ناوخۆییو دەرەکیدا، یان لەسەر ئاستی چالاکییەکان، بۆ نمونە سەلاحەددین لە سەرەتای تەمەنی سیاسی خۆیدا لەڕوانگەی ئەم پێناسەیەی سەرەوە لە بواری جەنگی ستراتیژیدا یەکەم

---

١ عبدالله: الحرب النفسية والشائعات ، ل١٣.

٢ الدباغ: المرجع في الحرب النفسية، ل٤٨.

٣ حاتم: الاعلام و الدعاية، ل١٨٧.

٤ علي: حرب الكلمة، ل٦٨.

هەڵەی کرد، کاتێك لە کۆبوونەوەی (ئەنجومەنی جەنگی)[5]دا ویستی ڕوو بەڕووی (نورالدین محمود)[6] ببێتەوە، ئەگەر بێت و مصری لێ وەربگرێتەوە، بەڵام باوکی[7] ژیرانەو ستراتیژیانە لە ڕوویدا وەستایەوە،

---

٥ ئەنجومەنی جەنگی: ئەم ئەنجومەنە لەکاتی پێویستدا کۆدەبۆوە، بەتایبەتی لە کاروباری جەنگیدا، بەسەرۆکایەتی سوڵتان سەلاحەددین و ئەندامانی و هاوڕێ دێرینەکانی و فەرمانـدە دڵسۆزەکانی، گرنکترین ئەندامانی ئەم ئەنجومەنە (الملك العادل)ی برای بوو، چونکە بۆچوونەکانی لەجێگای خۆیدا بووە، سوڵتان زۆر پابەند بوو بە بۆچوونەکانییەوە هەرچەندە دوور بووایە، چاوەڕوانی وەڵامی ئەوی دەکرد، و یەکەم کۆبونەوەی ئەم ئەنجومەنە لەڕۆژی هەینی (١ی محرمی ساڵی ٥٦٧ك/١١٧١ز) بوو کاتێك سەلاحەددین پێشنیاری (نورالدین محمود)ی خستە بەردەستیان کە ئارەزووی لادانی ناوی خەلیفەی فاتیمیەکانی لە ووتاری هەینیدا هەبوو. (ابن الاثیر: الکامل، مج٧/ ل٢١٨" حسین: الجیش الایوبی في عهد صلاح الدین، ل١٩٧-١٩٨" :Lane pool Ahistory of Egypt in the Middle ages, p.196).

٦(نورالدین محمود) لەساڵی (٥١١ك /١١١٨ز) لەشاری حەڵەب لەدایك بووە، کوڕی (عماد الدین زنگی)ە، پاش مردنی باوکی ساڵی (٥٤١ ك /١١٤٧ز) دەسەڵاتی وەرگرت، فەرمانڕەوای (شام و جەزیرە و مصر ) بووە، بەپاشای چاکەخواز ناوبانگی دەرکردووە، هەروەها بەچاکترین و دادپەروەرترین پاشاکانی سەردەمی خۆی دەژمێردرێت. (ابن الجوزي: المنتظم في تأریخ الملوك الامم، ج١٠/ ل٢٤٨-٢٤٩" سبط ابن الجوزي: مرآة الزمان في تأریخ الاعیان، ج٨/ ل٣٠٥" ابو شامة: الروضتین، ج١/ ل٢٢٧ -٢٢٩).

٧ ناوی (ایوب بن شادی بن مروان)ە باوکی سوڵتان سەلاحەددینە، ڕەچەڵەکی ئەیوبیەکان هەرهەموو بۆ ئەو دەگەڕێتەوە، خەڵکی شاری (دوین )ە، باوکی والی قەڵای (تکریت) بوو (أیوب) لەگەڵیدا بووە تاوەکو مردنی، پاشان شوێنی باوکی گرتەوە، دوای لادانی لەسەر دەسەڵات بەرەو (موصل ) کۆچی کرد، ماوەیەك لەوێ مایەوەو ببوە والی قەڵای (بعلبك)، پاشان چووە خزمەتی (نورالدین محمود) لەشاری (دمشق)، لەشاری (القاهرە) کۆچی دوایی کرد، دواتر تەرمەکەی گوێزرایەوە بۆ (المدینە المنورە). بۆ زیاتر

کاتێکیش لەگەڵ سەلاحەددینی کوڕی لەو ئەنجومەنە جیابوونەوە پێی وت: "کوڕم تۆ نەفامی و شارەزاییت کەمە، چۆن ئەم (ئەنجومەن)ە کۆدەکەیتەوەو لەڕازو نیازی خۆت ئاگاداریان دەکەیت"، ئەگەر (نورالدین محمود) بیستی تۆ ڕێگری لە هاتنی بۆ مصر، هانی دەدەی زیاتر پەرۆشی هاتن بێت، گریمان بڕیاری هاتن بدات، دڵنیابە زۆربەی ئەندامانی ئەم ئەنجومەنە لەگەڵتا نابن، هەروەها پاش ئەم کۆبوونەوەیە، نەیاران هەواڵی ئەم کۆبونەوەی پێ ڕادەگەیەنن، بەڵام پێش ئەوان تۆ بۆی دەنووسی و دەڵێیت: "چی پێویست دەکات بە هاتنی بەڕێزتانە بەڵکو هەرکەسێك لەلای جەنابتانەوە بێ و گوریسێك لە گەردنمان بنێت بۆ خزمەتی بەڕێزتان ئامادەین، ئەگەر ئەمەی بیست ڕای لە بەرامبەرمان دەگۆڕێت".[8] وەکو لەم دێرە شیعرە هاتووە:

کیفما تحکمون فنحن عبید مطیعون

وکیفما تأمرون فنحن خدم مخلصون[9].

ڕووداوەکان پێشبینیە ستراتیژییەکەی باوکی سەلاحەددینیان سەلماند، ئەوە بوو (نورالدین محمود) کۆچی دوایی کرد، وسەرەتای کێشەو ئاژاوە لە ناوچەکە سەریهەڵدا، سەلاحەددین ئامۆژگارییەکەی باوکی لەگوێ گرت، لە دانانی پلانەکانی بەنهێنی، بەشێوەیەك بەردەوام بوو لە پشتگیریکردنی

---

زانیاری بڕوانە: (سبط أبن الجوزی: س.پ، ج٨/ ل٢٩٥" ابو شامة: الروضتین، ج١/ ل٢٠٩" ابن خلکان: وفیات الاعیان، ج١٠/ ل٨٤" الزرکلي: الاعلام، ج٢/ ل٣٢).

٨ ابن الاثیر: التاریخ الباهر في الدولة الآتابکیة، ل١٥٨-١٥٩" ابو شامة: الروضتین، ج١/ ل٢٠٤" أبن واصل: س.پ،ج١/ ل٢٢١-٢٢٢" أبن خلدون: تأریخ أبن خلدون، ج٥/ ل٢٥١" البدلیسي: شرفنامە، ل١٧٨-١٧٩.

٩ البدلیسی: س.پ، ل١٧٩. واتە (چۆن بڕیاردەدەن ئێمە بەندەی ملکەچین و چۆن فەرمان دەدەن ئێمە خزمەتکاری دڵسۆزین).

(الملك الصالح)[10] کوڕی (نورالدین محمود) تا توانی کۆتایی بە هەموو بەرگرییەکی نەیارەکانی بهێنێت،[11] ئەوەش بە دانانی بەرنامەیەکی مەزن و فراوان بۆ بەهێزکردن و درێژەپێدان و بەردەوامی کاروانی خەبات و ڕەوتی جیهاد بەرێکوپێکی، سەلاحەددین لەشێوازە دەروونییە ستراتیژییەکانی تەنها گرنگی بە چاکسازی بارودۆخی ناوخۆیی مصر و دوورخستنەوەی ئەو مەترسیانەی لەسەر ئاسایشی مصرو گەلەکەیدا هەبوو لە چوار چێوەی سنووری خۆیدا نەدەدا، بەڵکو بیری لە ئامانجێکی دەروونی ستراتیژی دوور مەودا کردەوە، ئەویش پاراستنی سنووری مصر بوولە مەترسییەکانی دەرەوە، چونکە وڵاتی مصر خاوەن سنوورێکی بەر فراوان بوو، هەروەها وا سەیری ئەم وڵاتەی دەکرد کە کانیەکی هەڵقوڵاوە بۆ ئەوەی هێزەکانی دەریایی و وشکانی سوودی لێ ببینن[12]، ئەگەر بێت وسنوورەکەی پارێزراو نەبێت ئەوا پیلانی ئاژاوە گێڕان لە دژی هەوڵەکانی سوڵتان سەلاحەددین بۆ یەکخستنی بەرەی ئیسلامی لە دژی خاچ دروشمەکان بەردەوام دەبێت، بۆیە پێی وابوو پاراستنی وڵاتی مصر پێویستی بەدەست بەسەرداگرتنی

---

١٠ الملك الصالح اسماعيل: کوڕی (نورالدین محمود)ە، (٥٥٨-٥٧٧ك/ ١١٦٢-١١٨١ز)، لەپاشاکانی بنەماڵەی زەنگیە لەشام و جەزیرە، پاش کۆچی دوایی باوکی ساڵی (٥٦٩ك/١١٧٤ز)، دەسەڵاتی (دیمەشق و حلب)ی گرتە دەست لە تەمەنی (١١) ساڵیدا، بۆیە میر (شمس الدين محمد بن عبدالملك بن المقدم بن خلدون) کاروباری دەوڵەتەکەی بۆ دەبرد بەڕێوە، لەتەمەنی (١٩) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد. (سبط أبن الجوزي: س.پ، ج٨/ ل٣٦٦" المقريزي: السلوك، ج١/ ل١٦٧" ابن تغري بردي: س.پ، ج٦/ ل٨١-٨٢).

١١ ابن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٢٢٠-٢٢١" الذهبي: العبر في خبر من غبر، ج٤/ ل١٩٥-١٩٦" المقريزي: السلوك، ج١/ ل١٥٤"بيومي: قيام الدولة الايوبية، ل٢٠٠" حسن: س.پ، ج٤/ ل١٠٥" سعداوي: التاريخ الحربي، ل٢٣.

١٢ يوسف: العرب والروم واللاتين، ل٢٧٩.

دەوروبەرە ستراتیژییەکانی هەیە، ئەویش لە باشوور وڵاتی (النوبە)[١٣]، و لەڕۆژهەڵات (الیمن والحجاز) و لەڕۆژئاواشەوە ناوچەی (برقە)[١٤]، بێگومان کۆنترۆڵ کردنی ئەم وڵاتە ئیسلامییانەو تێکەڵ بوونیان لەگەڵ مصر، بەهەنگاوێکی ستراتیژی زۆر گەورە دەژمێردرێ لە پێناوی یەکێتی و یەکخستنی هێزە ئیسلامیەکان لە ناوچەکەدا، کە سەلاحەددین هەوڵی دڵکاری بۆ دەدا بەمەبەستی زەمینە ڕەخساندن بۆ قۆناغی دووەم، ئەویش جیهاد بوو لە دژی خاچ دروشمەکان کە دوژمنی سەرەکی موسڵمانانن[١٥]، دەوڵەتی ئەیوبی لە سەرەتای دروست بوونیەوە پێویستی بە هێزێکی جەنگی هەبوو پشتی پێ ببەستێت، بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی نەیارو دوژمنەکانی ببێتەوە، و ئامانجە دەروونیە ستراتیژیەکانی پێ جێبەجێ بکات، ئەوە بوو سەلاحەددین پەنای بردە بەر جیهاد کردن لە پێناوی خودادا[١٦]، چونکە پێویستییەکی ئایینییە و لەسەر هەموو موسڵمانان ئەرکە، و قورئانی پیرۆز فەرمانی پێکردووەو لەفەرموودەکانی پێغەمبەر

---

١٣ (النوبة) وڵاتێکی سنور بەر بڵاوە، دەکەوێتە باشوری مصر، (نصاری)ن، ژیان و گوزەرانی دانیشتوانی زۆر گران بوو، سەرەتای وڵاتەکەیان لە (أسوان)ەوە دەست پێدەکات، و شاری (النوبة)- ناوی (دمقلة) بوو کە شوێنی پاشا بوو لەسەر کەناری روباری نیل. (ناصر خسرو: س.پ، ل٨١" یاقوت الحموي:س.پ، مج٤/ ل٤٠٥-٤٠٦).

١٤برقە: ناوچەیەکی گەورەیە پێکهاتووە لە کۆمەڵێك شار و دێ لە نێوان ئەسکەندەریە و تونس، و ناوی شارەکە (انطابلس) بووە بە واتای پێنج شارەکە دێت.( یاقوت الحموي:س.پ، مج١/ ل٣٠٨).

١٥ ابن دقماق: الجوهر الثمين في سيرة الملوك والسلاطين، ج٢/ ل١٦" سبط أبن الجوزي: س.پ، ج٨/ ل٤٢٨" يوسف: الوحدة وحركات اليقظة العربية أبان العدوان الصليبي، ج٤/ ل٢٧-٢٨.

١٦ أبن شداد: س.پ، ل٢٨" الدواداري: كنز الدرر، ج٧/ ل١٠٠.

(د.خ)دا جەختی لەسەر کراوە، ئەمەش ئەرکێکە لەسەر شانی هەموو موسڵمانێك کە توانای هەبێت بەلەش جیهاد لە پێناوی خودادا بکات[17]، هەربۆیە سەلاحەددین و گوتار بێژەکانی ئەوەیان بەبیری خەڵکی و جەنگاوەرەکاندا دەهێنایەوە، کە هەر کەس لە ڕێگای خودادا بکوژرێت شوێنی بەهەشتە[18]، وەکو لەم ئایەتەدا هاتووە: {إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنْفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ} [19]، بێگومان شەهید بوونیش ئاواتی بەرزی موسڵمانە خۆبەخت کەرەکان بوو، بۆ بەدیهێنانی یەك لەو دوو ئامانجە، کەسەرکەوتن یان شەهید بوون بوو. لە ڕاستیدا ئەو دروشمە هۆکارو پاڵنەرێکی دەروونیی گەورە بوو بۆ سەربازانی سەلاحەددین تا لەگەڵ دوژمندا بەڕاستی بجەنگن[20]، هەروەها وەکو لەم ئایەتەدا هاتووە :{وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتاً بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ}[21]، ئەم بڕوایە وورەی جەنگاوەرەکانی بەرز دەکردەوەو هانی دەدان بەردەوام ئامادەبن بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی خاچ دروشمەکان.

---

17 هموندی: پوختەی فقهی شەریعەت، ل ٦٠٥-٦٠٦ .

18 سبط أبن الجوزي: س.پ، ج٨/ ل٣٢٣" الحنبلي: شفاء القلوب في مناقب بني أيوب، ل٩٠.

19 واتە (خودا گیان و سامانی باوەڕدارانی کڕیووەو لە باتیاندا دەیانخاتە بەهەشتەوە). (سورەتی تەوبە، ئایەتی ١١١، وەرگێڕانی ماموستا هەژار).

20 الدواداري: س.پ، ج٧/ ل١٠٤" أبن خلدون: تأريخ أبن خلدون، ج٥/ ل٣٢١" قلعچی: صلاح الدين الايوبي،ل٣٩٠.

21 واتە (ئەو کەسانەی لە ڕێی خودادا کوژراون، هەرگیز نابێ بە مردویان حساب بکەن" هەر زیندوون خودا بژێویان دەداتێ") (سورەتی ال عمران، ئایەتی ١٦٩، وەرگێڕانی ماموستا هەژار).

کەواتە بەرزکردنەوەی دروشمی جیهاد ڕێبازێکی دەروونی ستراتیژی سەلاحەددین بوو، لە جەنگەکانیدا لەگەڵ نەیارانیدا بەگشتی و خاچ دروشمەکان بەتایبەتی، بۆ نموونە: قازی (أبن شداد) باس لە سەلماندنی ئەو ڕاستەیە دەکات و دەڵێت: "دوای گرتنی قەڵای (کوکب)[٢٢] لە (١٥)ی ذی القعدە ساڵی (٥٨٤ك/١١٨٩ز)دا پشووی بە لەشکرەکانیدا،و هێزەکانی مصر بەسەرکردایەتی (الملك العادل)[٢٣]ی برای بۆ گەڕانەوە ئامادە کرد. سوڵتان بڕیاریدا لەگەڵیاندا بڕوات تا (عسقلان)[٢٤]و لەوێ ماڵئاواییان لێ بکات و خۆی لەکەناری دەریاوە بگەڕێتەوە بۆ (عکا) و سەر لە هەموو ناوچەکانی کەناری دەریا بداو کاروباریان ڕێك بخات، داوایان لێکرد وانەکات، چونکە

---

٢٢ کوکب: قەڵایەکی بەهێز بوو لە باشووری دەریاچەی (طبرية) لەسەر ئەو چیایەی کە بەتەنیشت شاری (طبرية)، دەڕوانێتە دۆڵی (الاردن)، سوڵتان سەلاحەددین ڕزگاری کرد، پاشان وێران کرا. (یاقوت الحموي: س.پ، مج٤/ ل١٦٣).

٢٣ (الملك العادل) لە ساڵی (٥٤٠ك/١١٤٥ز) لە شاری دیمەشق لە دایك بووە، پیاوێکی دادپەروەرو خانەدان بووە، ڕاوبۆچوونی لەجێگای خۆی بووە، لەگەڵ مامی (أسد الدین شێرکۆ)و سەلاحەددینی برای گەیشتە ولاتی مصر، جێگری سوڵتان بوو و بەشداری زۆربەی شەڕەکانی ولاتی شامی کرد، لە ساڵی (٦١٥ك/١٢١٨ز) لە شاری دیمەشق کۆچی دوایی کردووە. (أبو شامة: الذیل علی الروضتین، ل١١" أبن خلکان: س.پ، ج٢/ ل٧٤-٧٩).

٢٤ (عسقلان) شارێکە لە خوارووی فەلەستین لە کەناری دەریای نێوان (غزەو بیت جبرین)، هەروەها پێی دەڵێن بووکی شام لە جوانیدا، خاچ دروشمەکان لە ساڵی (٥٤٨ك/١١٥٣ز) دەستیان بەسەریدا گرت، بەلام سوڵتان سەلاحەددین توانی لە ساڵی (٥٨٣ك/١١٨٧ز) ڕزگاری بکات، پاشان لە ساڵی (٥٨٧ك/١١٩١ز) بڕیاری تێکدان و وێرانکردنیدا لە ترسی داگیرکردنی لەلایەن خاچ دروشمەکان. (أبن عبدالحق: مراصد الاطلاع علی اسماء الامکنة والبقاع، ج٢/ ل٩٤٠" أبن الفرات: تاریخ أبن الفرات، مج٢ ج٢/ ل٢٩" المقریزي: السلوك، ج١/ ل١٧٥).

ژمارەیەکی کەم سەربازی لەگەڵدا دەمێنێتەوەو خاچ دروشمەکان هەموو لە شاری (صور) [٢٥] کۆبوونەتەوە نەوەك پەیمان بشکێنن، بەڵام سوڵتان گوێی نەدایەو ڕۆیشتە (عسقلان)و ماڵئاوایی لە (الملك العادل)ی برای کرد، بەکەناری دەریادا بەرەو شاری (عکا) گەڕایەوە، ئەم کاتە زستان بوو، دەریا شەپۆلی گەورەی وەکو چیا بەرز دەبووەوە. کاتێك من بیرو خەیاڵم لەسەر ئەمە بوو، سەلاحەددین ئاوڕی لێدامەوە گوتی: "شتێکم لە دڵدایە پێت دەڵێم: هەرکاتێك خوای گەورە ڕزگارکردنی کەناری دەریاکانی بۆ ئاسان کردم، کاربەدەست بۆ وڵات دادەنێم، وەسیەتیان بۆ دەکەم،و ماڵئاواییان لێدەکەم،و سواری ئەم دەریایە دەبم بەشوێن داگیرکەراندا دەگەڕێم، بەدوایان دەکەوم، تاکو یەك بێ باوەڕ لەسەر ڕووی زەوی ناهێڵم یان لەم ڕێگایەدا دەمرم،.. ئەم قسەیە لەلام زۆر گەورە بوو"، پاشان (أبن شداد) بە سەلاحەددینی گوتووە: "سوڵتان نابێ خۆی‌و سەربازەکانی تووشی ئەم زەحمەتە بکات‌و لەم دەریایە بدات، چونکە ئەم سەربازانە قەڵغانی ئیسلامن، لەوەڵامدا گوتوویەتی: من ڕای تۆ وەردەگرم، کام مردنیان بەڕێزە؟ وتم: بێگومان مردن لە ڕێی خودادا، وتی: ئامانجی من لەم هەموو خەبات‌و ماندوو بوونەم لە جەنگدا ئەوەیە کە بە بەڕێزترین مردن بمرم". [٢٦] لێرەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە سوڵتان سەلاحەددین هەموو کارو چالاکی‌و ماندوو بوونی جیهاد بووە لە پێناو خودادا.

---

٢٥ (صور) شارێکی کۆن‌و بەناوبانگە، دەکەوێتە سەر دەریای شام لە باشووری بەیروت لە لوبنان، یەکێکە لە (ثغوری)ەکانی موسلمانان، چۆتە ناو دەریا، بە ئاسانی دوژمنان پێی نەدەگەیشتن، چونکە چواردەوری دەریا بوو. (ناصر خسرو: س.پ، ل٥٠" أبن عبد الحق: س.پ، ج٢/ ل٨٥٦).

٢٦ النوادر السلطانیة، ل٢٩-٣٠.

لەچوارچێوەی شێوازە دەروونییە ستراتیژییەکاندا سەلاحەددین کە بۆ ئاسۆیەکی دوور کار دەکات ئاوا مەزەندەو ئەنجامەکانیشی درێژ خایەن‌و کاتێکی زۆریشی دەوێ، هەڵمەتێکی سەربازی لە جمادی یەکەمی ساڵی (٥٦٨ك/١١٧٣ز) بە فەرماندەیی (توران شاه)[٢٧]ی برای بۆ وڵاتی (النوبە) لە باشووری مصر دەستپێکرد[٢٨]، هەڵمەتەکە گەیشتە سەرەتای وڵاتەکەیان لەسەر کەنارەکانی ڕۆژهەڵاتی نیل سوپاکە دابەزی، بە دووری (١٢٠) میل لە باشووری (أسوان)، توانیان دەست بەسەر قەڵای (أبريم) دابگرن، ئەوە بوو (توران شاه) ماوەیەك مایەوە، بەڵام بێزاری تەنگی پێ هەڵچنی‌و بەجێی هێشت[٢٩]،و لەشوێنی خۆی پیاوێکی بەناوی (أبراهيم الكردي)[٣٠] دانا،و

٢٧ (توران شاه ): ناوی (توران شاه بن ايوب بن شادی، فخرالدين، شمس الدولة) بەواتای پاشای ڕۆژهەڵات، برا گەورەی سەلاحەددین بوو لە باوکەوە، لە شاری دمشق پەروەردە بوو، لە ساڵی (٥٦٩ك/١١٧٤ز) لە هەڵکمەتێکدا سەلاحەددین لەگەڵ میرەکانی (بنو الرسول) ڕەوانەی وڵاتی (اليمن)ی کرد، پاش دەست بەسەراگرتنی ناوچەکە ساڵی (٥٧١ك/١١٧٥ز) گەڕایەوە شام، لە ساڵی (٥٧٤ك/١١٧٨ز)دا گەیشتە مصرو لەوێ کۆچی دوایی کرد. (سبط أبن الجوزي) دەڵێت: "خۆی بە موستەهەقتر دەزانی لە سوڵتان سەلاحەددین لە فەرمانڕەوایی، لەکاتی خەیاڵیدا هەندێك قسەی دەکرد، بۆیە سەلاحەددین دوری خستەوە بۆ وڵاتی (اليمن)". بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە (مراة الزمان، ج٨/ ل٣٦٢" الخزرجي: العقود اللؤلؤية في تاريخ الدولة الرسولية، ج١/ ل٢٦" اليونيني: ذيل مراة الزمان، ج١/ ل١٥.

٢٨ أبن خلدون: تاريخ أبن خلدون، ج٥/ ل٢٨٧" رنسيمان: تاريخ الحروب الصليبية، ج٢/ ل٦٤٣.

٢٩ أبن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٢٢١" أبو شامة: الروضتين، ج١/ ل٢٠٨" ابن كثير: س.پ، ج١٢/ ل٣٦٠" أبن خلدون: تاريخ أبن خلدون، ج٥/ ل٢٨٧" المقريزي: السلوك، ج١/ ل٥١" Lanepoole: Saladin, P,P. 101.

بەرەو شاری (قوص)[31] بەڕێکەوت[32]، پاشان ڕاپۆرتێکی ئامۆژگاری ئامێزی دەربارەی دانیشتوانی وڵاتی (النوبة) بۆ سەلاحەددین ڕەوانە کرد، کە پشتیان پێ نەبەستێت، چونکە وڵاتێکی کەم دەرامەتەو هاوکات ئاوو هەوای لەبار نییە[33]، لەم ڕاپۆرتەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە سەلاحەددین هەر چەند ئامانجی ئابووری هەبێت، بەڵام پتر ئامانجی دەروونیی ستراتیژی دوور مەودای هەبووە، چونکە سەلاحەددین و بنەماڵەکەی لەوە دڵنیا بوون کە (نور الدین محمود) سوورە لەسەر هاتن بۆ وڵاتی مصر بۆ لابردنیان لەسەر دەسەڵات[34]، ئەمەو جگە لەوەی کە وڵاتی (النوبة) پێشتر ببووە شوێنگەی پیلان دارشتن و ئاژاوەنانەوە لەلایەن پاشماوەی هەڵهاتوانی

---

٣٠ أبراهيم الكردي: لە سەردەمی سوڵتان سەلاحەددیندا ساڵی (٥٦٨ك/١١٧٣ن)،و لە کاتی هەڵمەتی (توران شاه) بۆ وڵاتی (النوبة) داوای بەخشینی قەڵای (ابريم)ی لێکرد، لەگەڵ کۆمەڵێك لە کوردەکان، کەبەبەردەوامی هێرشیان دەکردە سەر وڵاتی (النوبة)،و لەئەنجامدا پارەو مەڕو ماڵاتیان زۆر دەسکەوت، پاشان لە دوورگەی (ذيدان)ی سەر بە (النوبة)، (أبراهيم الكردي) نغرۆ بووو کۆچی دوایی کرد. (أبو شامة: الروضتين، ج١/ ل٢٠٩).

٣١ قوص: یەکێکە لە شارە کۆن و گەورەکانی مصر، لە ڕۆژهەڵاتی (النيل)، ناوی (Hat Hor) واتە کۆشکی خواوەند (مۆريس)ە، هەروەها (بربير قوص) یاخود (قوص المارة)ی پێ دەوترێت، لە کۆتایی سەدەی سێیەمی کۆچی بەناوی (دقلديانوس) دەناسرا. (رمزي: القاموس الجغرافي، ج٤ ق٢/ ل١٨٧).

٣٢ أبو شامة: الروضتين، ج١/ ل٢٠٩" شاكر: التاريخ الاسلامي، ج٦/ ل٣٢٠.

٣٣ أبن الاثير: الكامل، ج٧/ ل٢٣٢" شاكر: س.پ، ج٦/ ل٣٢٠"
Lane Poole: Ahistory of Ehypt. P.197 ,

٣٤ أبن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٢٣١.

(فاتیمیەکان)[35، 36] ئەم هۆکارانەو هەندێ هۆکاری دەروونیش وای لێکردن بیر لەم جۆرە شێوازە دەروونییە لە سنووری باشووری مصر و خۆ تەرخان کردنو ئامادە بوون لە پێناو پڕۆژە گەورە ستراتیژییەکاندا بکات، ئەویش یەك بوونی بەرەی ئیسلامی و دەرکردنی خاچ دروشمەکان لە ولاّتی شامدا بوو، هەروەها سەلاّحەددین بۆ جێبەجێ کردنی ئەو پلانە هەلّمەتێکی سەربازی تری بۆ ولاّتی (افریقیە و طرابلس الغرب) لە سالّی (٥٦٨ك/١١٧٣ز) بە فەرماندەیی (شرف الدین قراقوش)[37] لە ژێر چاودێری (تقی الدین عمر)[38] نارد[39]، لەگەلّ (٥٠٠) سەرباز، بەمەبەستی پاراستنی

---

٣٥ فاتمیەکان: بنەمالّەیەکی شیعەی ئیسماعیلی بوون، بەرەچەلّەك خۆیان دەبردەوە سەر (علی بن أبی طالب) و فاتیمەی خێزانیو کچی پێغەمبەر (د.خ)، لە سالّی (٢٩٧ك/٩٠٩ز) لە شاری (سجلماسای) ئەفریقیا دەولّەتیان دامەزراند، سەرەتا لە تونسدا و پاشان لەسەرتاسەری باکووری ئەفریقیاو مصردا، لە سەردەمی خەلیفە (معز الدولة) بە فەرمانی ئەو شاری قاهیرەیان درووست کرد وەکو پایتەختی خەلافەتی فاتیمی، بەلاّم لە سالّی (٥٦٧ك/١١٧٢ز) لەسەردەستی سولّتان سەلاّحەددین کۆتایی بەفەرمانڕەوای خەلافەتیان هێنا بە دامەزراندنی دەولّەتی ئەیوبی. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە (أبن ظافر: أخبار الدول المنقطعة" المقریزي: اتعاظ الحنفا باخبارالائمة الفاطمیین الخلفاء" سرور: الدولة الفاطمیة في مصر).

٣٦ ا.ر.جب: صلاح الدین الایوبي، ل١٢٢.

٣٧ شرف الدین قراقوش: ناوی (شرف الدین قراقوش التقوی)ە، یەکێك بوو لە مەمالیکی (تقی الدین عمر)، لە سەردەمی سولتان سەلاحەددین فەرماندەیی هێزە ئەیوبییەکانی کرد بۆ ولاّتی (افریقیە)، لە سالّی (٦٠٩ك/١٢١٢ز) کۆچی دوایی کرد. ئەمە جیاوازە لەگەلّ (بهاء الدین قراقوش) ە کە وەزیری سولتان سەلاحەددین بوو.(ابن خلکان: س.پ،ج٤/ل٩٢).

٣٨ تقی الدین عمر: پێی دەوترا (أبي فتح و أبی سعید) و گەلێ نازناوی تری هەبوو، گرنگترینیان کە ناوبانگی پێ دەرکرد، الملك المظفر بوو، ڕۆلّێکی بەرچاوی هەبوو

سنووری ڕۆژئاوای مصر[40]، چونکه (بدو)ه دەشتەکیەکانی برقە بەردەوام بۆ وڵاتی مصر سەرچاوەی ئاژاوە گێڕی بوون بە تایبەتی لەسەردەمی خەلافەتی فاتیمیدا، بۆیە سوڵتان سەلاحەددین گرنگی بە دروستکردنی پردەکانی (الجیزة)[41] لەسەر ڕووباری نیل بەرامبەر (فسطاط) دا، بۆ ئەوەی هێزە سەربازیەکانی لەکاتی هێرشی دوژمن لە ڕۆژئاواوەو هاتنی لافاو بە پیادە بپەڕنەوە[42]، لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەو زنجیرە کەنارییەی برقە شوێنگەیەکی ستراتیژی گرنگی بە سوڵتان سەلاحەددین بۆ بەرگری کردن لە دەوڵەتەکەی دا، ئەوە بوو بە درێژایی سەردەمی دەوڵەتی ئەیوبی سنووری ڕۆژئاوای مصر تووشی هیچ هێرشێکی دەرەکی نەبووەوە[43].

---

لەسەردەمی سوڵتان سەلاحەددین لە شەڕی دژ بە خاچ دروشمەکان. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (ابراهیم: الملك المظفر تقی الدین عمر، رساله ماجستیر، جامعه صلاح الدین، اداب، سنه ١٩٩٤).

٣٩ الحموي: التاریخ المنصوري، ل١٨٠" ابو الفداء: المختصر في اخبار البشر، ج٣/ ل٥٣" الحنبلي: س.پ، ل٨٢.

٤٠ أبن الاثیر: الکامل، مج٧/ ل٢٣٢" أبن واصل: س.پ، ج١/ ل٢٣٧-٢٣٨" النویري: س.پ، ج٢٨/ ل٣٧١" أبن العماد: شذرات الذهب في اخبار من ذهب، ج٢/ ل٢٢٥" أبن کثیر: س.پ، ج١٢/ ل٣٦١" أبن خلدون: تاریخ أبن خلدون، ج٥/ ل٢٨٦" المقریزي: السلوك، ج١/ ل١٧١" البدلیسی: س.پ، ل١٨٠.

٤١ الجیزة: شارێکی مصرییە لە دەوروبەری (القاهرة) دەکەوێتە ڕۆژئاوای (الفسطاط) لەسەر کەناری ڕووباری (نیل)ی ڕۆژئاوا، بە (ئەهرامات) بەناوبانگە. (یاقوت الحموي: س.پ، مج٢/ ل١٠٣-١٠٤).

٤٢ الدواداري: س.پ، ج٧/ ل١٠٠.

٤٣ سعداوي: التاریخ الحربي، ل٤١" Lane Poole: Ahistory of Egypt, P.197, Saladin, P.P. 124-128.

ئەمە جگە لەوەی کە سولْتان سەلاحەددین لە پشت ئەم شێوازە دەرونییەوە ئامانجی تری هەبوو، ئەویش گەڕاندنەوەی دەسەلاتی مصر بۆ ناوچەکەو بنبڕ کردنی ئاژاوە لە باکووری ئەفریقیا بوو، بەتایبەتی لە پاشماوەی شیعە فاتیمیەکان، بەمەش توانی ئامانجە ستراتیژیە دەروونییەکەی لە گێڕانەوەیان بۆ ژێر ئالا[44] و یەکێتی دەوڵەتەکەی

دەوڵەتەکەی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی خاچ دروشمەکان جێبەجێ بکات[45].

---

٤٤ ئالا: سولْتان سەلاحەددین هەلۆی کردبووە سومبلێك بۆ ئالای دەوڵەتەکەی، وەك دەربڕینێك بۆ هاندانو پەلاماردانی دوژمنانی موسلْمانان، ڕەنگەکەشی زەرد بوو، (علم الدین الشاتانی) شاعیر وتویەتی: "سەرکەوتن دەبینم بە ئالاکەتەوە هەلْواسراوە، مەوەستە تۆ شایستەی ئەوەی کە دنیا داگیر بکەی". (العماد الكاتب: البرق الشامي،ج٣/ ل٢٩" أبن الاثير: الكامل، ج٧/ ل٣٣٥" حتي: تاريخ العرب، ل٧٥٦" حسين: س.پ، ل١٦٨).

٤٥ لە ڕاستیدا سولْتان سەلاحەددین لەیەکەم هەلْمەتدا بە فەرماندەیی (قراقوش) هەموو ولاتی مەغریبیان کۆنترۆڵ نەکرد، بەلْکو لە سالْی (٥٦٨ك/١١٧٣ز) تەنیا (برقةو طرابلس) بەشێك لە ڕۆژهەلاتی (تونس) تاوەکو (قابس)یان کۆنترۆڵ کرد، (أبن واصل: س.پ، ج١/ ل٢٣٥" أبو الفداء: س.پ، ج٣/ ل٥٣" الذهبي: دول الاسلام، ج١/ ل٨١")، پاشان لەنێو سالانی (٥٧١-٥٧٣ك/ ١١٧٥-١١٧٧ز) هەلْمەتەکەیان بۆ سەرناوچەکە بەردەوام بوو، (أبو شامة: الروضتين، ج١/ ل٢٦٠" المقريزي: السلوك، ج١/ ل١٧٥) هەروەها لە سالْی (٥٧٧ك/١١٨١ز) توانیان دەست بەسەر ولاتانی (هوارة، زواده، لواتة، جبل، نفوسةو غدامس) بگرن، لەسالْی (٥٨٣ك/١١٨٧ز) (قراقوش) توانی دەست بەسەر شاری (قيروان) دابگرێت دوای شەڕێکی بەهێز لەگەڵ سولْتانی مەغریب (أبن عبد المؤمن)، بەمەش سەلاحەددین لە سنووری دەوڵەتە بەرفراوانەکەی دلْنیا بوو و ئامانجەکەی پێکا. (أبن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٢٣٣" أبن خلدون: تاريخ أبن خلدون، ج٥/ ل٢٨٦" المقريزي: السلوك، ج١/ ل١٧٥، ١٨٦، ٢١٢" الخطط، ج٣/ ل٣٧٩). بۆزیاتر زانیاری بڕوانە نەخشەی ژمارە (١).

پیلانی ستراتیژی جەنگی دەروونی دەبێ ڕەچاوی سیاسەتی گشتی دەوڵەت بکات، هەرچەندە کارێکی قورس‌و گرانە هاوسەنگی بکرێت لەنێوان سیاسەتەکانی بەرەی ناوخۆو جەنگی دەروونی لە مەیداندا، چونکە پیلان لە جەنگی دەروونیدا تووشی نارەحەتی‌و زەحمەتێکی زۆر دەبێ لە هاوشان بوونی لە ڕێڕەوی سیاسەتی دەوڵەتدا[٤٦]، بۆ نمونە سەلاحەددین بۆ ڕاگرتنی ئەو هاوسەنگییە، دوابەدوای کۆنترۆڵ کردنی ولاتانی (النوبة و برقه)، بیری لە ڕزگارکردنی شوێنێکی ستراتیژی دەکردەوە لەچوارچێوی شێوازە دەروونییە ستراتیژییەکان. بەتایبەتی بۆی دەرکەوت ولاتی (النوبة) ئەو شوێنە ستراتیژیە نییە کەخۆی‌و بنەماڵەکەی وەکو شوێنێکی ستراتیژی قوولّ لەکاتی قەیراندا پشتی پێ ببەستن، ئەوەبوو بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەی ڕزگارکردنی ولاتی (الیمن) داوای مۆڵەتی لە (نورالدین محمود) کرد، هاوکات ئەوەیشی پێ ڕاگەیاند کەمەبەستی (عبدالنبی)[٤٧] دەڤەری (زبید)ە[٤٨]، چونکە ناوی خەلیفەی عەبباسی (المستضیء بأمر الله)[٤٩]ی

---

٤٦ نصر: س.پ، ج١/ ل٩٧.

٤٧ (عبدالنبی): ناوی (ابو الحسن علي بن مهدی)ە، خەڵکی گوندی (العنبره)بوو لەکەنارەکانی دەڤەری (زبید)، هەموو ساڵێك حەجی دەکرد، چاوی کەوت بەهەندێ زانایانی (العراق و الشام والحجاز) سەرنجیانی ڕاکێشا بۆ لای خۆی، شیعی مەزهەب بوو، خەڵکێکی زۆر شوێنی کەوت، تاوەکو لەساڵی (٥٤٥ك /١١٥١ز) ببوە (امام) لەولاتی (الیمن)، فەرمانڕەوایی ناوچەی (زبید)ی کرد لەنێو ساڵانی (٥٥٨ – ٥٦٩ك/ ١١٦٢– ١١٧٣ز). بڕوانە: (الذهبي: تاريخ دول الاسلام، ل٢٠٢"المقريزی: السلوك، ج١/ ل١٦٢" الزركلي: س.پ، ج٥/ ل٢٥).

٤٨ (زبید): شارێکی بەناوبانگە لەولاتی الیمن بەڕووی کەناری (باب المندب) کەوتۆتە سەر ڕێگای (عدن و مكه)، هەروەها پێی دەوترا (الخصیب) پاشان (الوادی)، لەسەردەمی خەلیفە ی عەبباسی(المأمون) تازەکرایەوە. (یاقوت الحموی: س.پ، مج٢/ ل٤٦٨).

لەووتاری هەینی هەڵگرتووە[٥٠]، (نورالدین محمود) بەداواکاریەکەی قایل بوو، بەم قایل بوونەش سەلاحەددین هەڵمەتێکی سەربازی بەفەرماندەیی (توران شاه)ی برا گەورەی ئامادە کرد بۆ دەست بەسەراگرتنی ولاتی (الیمن)[٥١]، بێگومان سەلاحەددین ئامانجی دەروونی ستراتیژی دوور مەودای هەبوو لەکۆنترۆڵ کردنی ولاتی (الیمن)دا، ئەویش جگە لەترسی هاتنی

---

٤٩ (المستضیء بأمر الله): ناوی (الحسن ابو محمد المستضئ بأمر الله بن یوسف المستنجد بالله)، لەساڵی (٥٣٦ك/١١٤١ز) لەدایك بووە، خەلیفەی عەبباسی ژمارە (٣٣) بوو، فەرمانڕەوای خەلافەتی عەبباسی بوو لەبەغداد لەنێو ساڵانی (٥٦٦-٥٧٥ك/١١٧٠-١١٨٠ ز)، لەسەردەمی ئەو خەلافەتی فاتمی رووخا لەولاتی مصر بەدەستی سوڵتان سەلاحەددینی ئەیوبی، پیاوێکی داد پەروەرو خانەدان بوو، هەروەها مەکوس و باجی لەسەر خەڵکی هەڵگرد، ماوەی (٩) ساڵ حوکمی کرد، لەتەمەنی (٣٩) ساڵی کۆچی دوایی کرد. (ابن تغری بردي: س.پ" ج٦/ ل٧٨" السیوطی: تأریخ الخلفاء، ل٤٤٥" شاکر: س.پ، ج٦/ ل٣١١).

٥٠ ابن الاثیر: الکامل، مج٧/ ل٢٣٧-٢٣٨" ابن کثیر: س.پ، ج١٢/ ل٣٦٤" ابن خلدون، تاریخ أبن خلدون، ج٥/ ل٢٨٧" ابن تغری بردی: س.پ، ج٦/ ل٦٣" ابن العماد: س.پ، ج٢/ ل٢٢٥" البدلیسی: س.پ، ل١٨١" شاکر: س.پ،ج٦/ ل٣٢٠).

٥١ هەڵمەتەکە لەمانگی رەجەبی ساڵی (٥٦٩ك/١١٧٤ز) بەڕێگای ڕووباری (النیل) دەستی پێکرد تا گەیشتە شاری (قوص)، پاشان بەوشکایی‌دا رۆیشت تاکو گەیشتە (عیذاب) لەکەناری دەریای سوور، پاشان لەدەریا پەڕینەوە تاکو گەیشتنە (جدة) لەوێشەوە بۆ شاری (مکە) دوای زیارەت کردنی کەعبە، هەڵمەتەکە گەیشتە (الیمن)، و دەستیان بەسەر دەڤەری (زبید)ە دا گرت، و (عبدالنبی) بەدیلی گیرا، لەگەڵ هەموو سەروەت و سامانیان، هاوکات قەلاکانیان کەوتە ژێر ئالای ئەیوبییەکان، (ابن الاثیر: الکامل، مج٧/ ل٢٣٨" ابو الفداء: س.پ، ج٢/ ل١٣٣" ابن کثیر: س.پ، ج١٢/ ل٣٦٥" قەفتان: مێژووی گەلی کورد، ل٢٢٦). بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە نەخشەی ژمارە (٢).

(نورالــدین محمــود) کەپێــشتر باسمــان لێــوەکرد[52]، هاوکــات هەســتی بەزیادبوونی ڕێژەی هێزە سەربازییەکانی و زۆری ژمارەی براکانی و فراوان بوونی دەسەڵاتی (توران شاه) کرد،[53] جگە لەهاندانی (عمارە الیمنی)[54] بۆ سەلاحەددین لەناردنی (توران شاه) بۆ وڵاتی (الیمن) تاوەکو دۆخەکەی لەبار بێت بۆ جێبەجێکردنی پیلانەکەی لەدژی سەلاحەددین[55]، بەڵام بێ

---

52 ابن الاثیر: الکامل، مج7/ ل237" المقریزی: الخطط، ج3/ ل59" سعداوی: التأریخ الحربي، ل43.

53 ابن شداد: س.پ، ل53" ابن تغري بردي: س.پ، ج6/ ل80" الرهاوي المجهول: تاریخ الرهاوي المجهول، ل200.

54 (عمارە الیمنی): شاعیرێکی لێهاتوو بوو، کاتێك دەوڵەتی فاتمی ڕوخا لەوڵاتی مصر، و لەشوێنی دەوڵەتی ئەیوبی دامەزرا، (عمارە) بەکۆمەڵێك لەبنەماڵەی سەلاحەددینی هەڵدا، پاشان لەگەڵ کۆمەڵێك لەگەورە پیاوانی شیعە ڕێککەوت بۆ گێڕانەوەی خەلافەتی فاتمی بۆ فەرمانڕەوایی وڵاتی مصر، بەڵام کاتێك سوڵتان بەپیلانەکەیانی زانی لەساڵی (569ك/1173ز) هەموویانی لە سێدارەدا، لەنێوانیان (عمارە الیمنی) لەگەڵدا بوو. (ابن خلکان: س.پ، ج3/ ل431-453" ابوالفداء: س.پ، ج2/ ل133" Lane Poole: Saladin.p. 126.

55 ئەم پیلانە لەساڵی (569ك/1174ز) لەلایەن (عمارە الیمنی) دژی سوڵتان سەلاحەددین نایەوە، ئەویش (عمارە) ژمارەیەکی زۆری لەلایەنگرانی خەلافەتی فاتمی کۆکردەوە لەشاری (القاهرە)و داوای لێکردن کە یەکێك لەمنداڵەکانی خەلیفە (العاضد) دابمەزرێنن بۆ ئەوەی دەسەڵات بۆ فاتمیەکان بگێڕێتەوە، ئەوەبوو بەخێرایی پەیوەندی بەخاچ دروشمەکانەوە کرد، بەمەبەستی یارمەتیدان و هەڵوەشاندنەوەی فەرمانڕەوایی سوڵتان سەلاحەددین، هاوکات (عمارە) توانی زۆر لەمانە بۆ جێبەجێکردنی پلانەکەی کۆبکاتەوە کەڕق و کینە یان هەبوو لەسەر دەوڵەتی ئەیوبی تازە دروست بوو، بەڵام یەکێك لەم پلان گێڕانە کە ناوی (زین الدین بن نجا) بوو، هەواڵەکەی گەیاندە سوڵتان سەلاحەددین، سوڵتان بڕیاری گرتن و کوشتنی دان لەچوارچێوەی جەنگە دەروونییە ستراتیژییەکەی بۆ ئەوەی ترس لە دڵ و دەروونی نەیارەکانی بچەقێنێ و لەدوا ڕۆژدا بیر

گومـان کـۆنترۆل کردنـی وڵاتـی (الـیمن) بەیـەکێك لـەپرۆژە دەرەکیـەکانی سـەلاحەددین دادەنرێـت، بەتایبـەتی دوای جێبـەجێکردنی پرۆژەکـانی ئەفریقیا کەئامانجێکی دەروونـی ستراتیژی گرنگـی لەپشتەوە بوو، لەوانە هاوسـەنگیکردن لـەنێوان سیاسـەتەکانی نـاوخۆو دەرەوەی دەوڵەتـدا، و لـەناودانی پـشتیوانانی خەلافـەتی فـاتمی لـەوڵاتی (الـیمن)[٥٦]، هـەروەها پاراسـتنی سـنووری باشـووری مـصر، چـونکە وڵاتـی (الـیمن) لـە ڕووی جـەنگیو بازرگانیـەوە کلیلـی دەریـای سـوور بـوو کەبەسـەر (الحبـشە)[٥٧]ی مەسـیحیدا دەڕوانـی[٥٨]، هاوکـات سەڵاحەددین بیری لـەئامانجێکی دەروونـی سـتراتیژی دوور مـەودا کـردەوە، ئـەویش ترسـی بڵاوبوونـەوەی بیرۆکـەی خاچـی بـوو لـەوڵاتی (الحبـشە) بـەڕێگای دەریـای سـووردا، بەمـەش سەڵاحەددینو دەوڵەتەکەی دەکەوتە نێوان دوو ئـاگر، ئاگرێك لەکـەنارەکانی دەریـای روم (ناوەڕاسـت) کەپێکهاتەکـەی میرنـشینی خـاچ دروشمەکانـە، و ئـەوەی تریـان لەکـەنارەکانی دەریـای سـورەوە کـە بریتیـیـە لـەولاتی

---

لەئاژاوەو خراپەکاری نە کەنەوەو مل کەچی فەرمانڕەواکانی سوڵتان بن. (ابن الاثیر: الکامل، مج٧/ ل ٢٣٨" العمري: مسالك الابصار، ج٧ ورقة ٦١-٦٢" ابو شامة: الروضتین، ج١/ ل٢١٦" النویري: س.پ، ج٢٨/ ل٣٧٣" الدواداري: س.پ، ج٧، ل٥٥" أبن خلدون: تاریخ ابن خلدون، ج٥/ ل٢٨٨).

٥٦ ابن شداد: س.پ، ل٧٤" ابو شامة: الروضتین، ج١/ ل٧٠" ابن واصل: س.پ،ج١/ ل٢٣٥-٢٣٦" الاسحاقي: اخبار الاول فیمن تصرف علی مصر من ارباب الدول، ل١٧٢" الدواداري: س.پ، ج٧/ ل٥٦.

٥٧ (الحبشة): ئەمڕۆ پێی دەوترێت (اثیوبیا) وڵاتێکە لەرۆژهەڵاتی ئەفریقیا لەسەر دەریای القلزم (سوور) نێوان (سودانو کینیاو صومالو جیوبتی). المنجد فی اللغة والاعلام ، ل٢٧.

٥٨ ابن الاثیر: الکامل ،مج٧/ ل٢٣٨" الدواداري: س.پ، ج٧/ ل٥٦-٦٧" ابن کثیر: س.پ، ج١٢/ ل٢١٥.

(الحبشه)[59]، هەروەها لەچوارچێوەی ئامانجە دەروونیە ستراتیژییەکەی بۆ یەکخستنی جیهانی ئیسلامی و گێڕانەوەی هێزە ئیسلامیەکان بۆ ژێر ئالای خۆی، لەساڵی (٥٦٨ك/١١٧٣ز) هێرشی کردە سەر (بدو- ە عەرەبە دەشتەکیەکان)ی نیشتەجێی دەوروبەری (الکرك[60] و الشوبك[61]) بۆ مسۆگەرکردنی سنووری دەوڵەتەکەی لەچوار چێوەی پرۆژە ستراتیژییە گەورەکەی و پاك کردنەوەی ناوچەکە لێیان و نەهێشتنی پەیوەندییەکانیان بەتایبەتی لەگەڵ خاچ دروشمەکان، چونکە هەواڵ و زانیاری گرنگیان پێ دەبەخشین لەبارەی جموجوڵی (سەلاحەددین)ەوە، هاوکات وەکو چاوساغ کاریان لەگەڵ دەکردن[62]. بێگومان سەلاحەددین لەکاتی هەڵمەتەکەیدا بۆ سەر (الکرك و الشوبك) ئەوەی بۆ دەرکەوت کەئامانجە دەروونییە ستراتیژییەکەی کە بۆ ئاسۆیەکی دوورە واپێویست دەکات نیمچە دوورگەی (سیناء) لەهەموو ئەو عەرەبە دەشتەکیانەی لەناو دۆڵ و سەر ڕێگای (مصر و شام)ن پاك بکاتەوە[63]، بۆیە بڕیاری دروستکردنی قەڵایەکیدا لەناو

---

٥٩ سعداوی: التأريخ الحربي المصرى، ل٤٣.

٦٠ الكرك: قەڵایەکی پۆڵاینە لە دیوی شام لە دەوروبەری (بلقاء) لە ناو چیاکانی (یاقوت الحموي: معجم البلدان، مج٤/ ل١٣١) ئێستا سەر بە ئوردنە.خاوەن شوێنێکی ستراتیژی گرنگ بوو، گرنگی ئەو شارە لەوەدا بوو کۆنترۆڵی ڕێگاکانی نێوان مصرو شام و حیجازی دەکرد، تاکە ڕێگا بوو کە ڕێبوار پیا دەڕۆیشت بۆ سوریاو حیجاز. (غوانمة: امارة الكرك الايوبية، ل١٠٥).

٦١ الشوبك: قەڵایەکی پۆڵاینە لە دەوروبەری شام لەنێوان (عمان و ايلة) نزيك الكرك. (ياقوت الحموي: س.پ، مج٣/ ل١٦١).

٦٢ ابن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٢٣٥" سبط أبن الجوزى: س.پ، ج٨/ ل٢٩٣" ا.ر. جب: س.پ، ل١٧٣" سعداوی: التاريخ الحربي، ل٣٤.

٦٣ ابو شامة: الروضتين، ج١/ ل٢٠٦-٢٢١" الغامدی: صلاح الدين و الصليبيون، ل١٤٥.

جەرگەی نیمچە دورگەی (سیناء) بەناوی (قلعە الجندی)[٦٤]، ئەمە جگە لەوە قوللەیەکی لە (السویس) دروستکرد کە جێگای (٢٠) سواری تێدا دەبووەوە[٦٥]، و سەربازەکانی لە سەردانا، هەروەها فەرمانیدا بەدەرکردنی هۆزی (بنو الجذام)ی عەرەبی بۆ (البحیره)[٦٦] و دەستی بەسەر هەموو دانەوێڵەو زەوی‌و زارەکانیاندا لە (الشرقیه)[٦٧] داگرت، چونکە دانەوێڵەیان بۆ خاچ دروشمەکان دەڕفاند[٦٨]، بەم کارەش سەلاحەددین پێش ڕێکەوتن بەرەو وڵاتی شام سنوورو ئامانجە دەروونییە ستراتیژییەکانی دەوڵەتەکەی لەهەموو لایەکەوە مسۆگەرکرد.

بەرزگارکردنی وڵاتانی (النوبە و برقە و افریقیە والحجاز والیمن) سەلاحەددین یەکەم قۆناغی لە قۆناغەکانی یەکگرتنەوەی وڵاتانی ئیسلامی لەچوارچێوەی پیلانە دەروونییە ستراتیژییەکانیدا جێبەجێکرد، بەمەش لەفەرمانڕەوایی ناوخۆو دەرەوەی وڵاتی مصر دڵنیا بوو، دوای نەهێشتنی هەموو ئەو کۆسپ‌و تەگەرانەی دەهاتنە ڕێگای پرۆژەکەی، هاوکات هەلێکی لەباری بۆ ڕێکەوت بۆ جێبەجێکردنی قۆناغی دووەم لەقۆناغەکانی

---

٦٤ قلعە الجندی: ئەم قەلایە کەپێی دەوترا قەڵای سەلاحەددین، دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی (عین سدر الغزیره) بەدووری (١) میل، هەروەها (٥٧)کم لەباشووری ڕۆژهەڵاتی (السویس)ی ئێستاوە دوورە. (سعداوی: التأریخ الحربي، ل٣٤).

٦٥ المقریزی: السلوك ، ج١/ ل١٨٥ .

٦٦ (البحیره): کورەیەکی ناسراوە لەدەوروبەری ئەسکەندەرییە لەمیسر، و بریتییە لە کۆمەڵە دێیەك، هاوکات خاوەن داهاتێکی زۆر بوون. ئێستا پارێزگایە و سەنتەری شاری (دمنهور)ە.(یاقوت الحموی: س.پ، مج١/ ل٢٧٩).

٦٧ (الشرقیه): کورەیەکە لەباشووری مصر. (یاقوت الحموی: س.پ، مج٣/ ل١٣٦).

٦٨ المقریزی: السلوك. ج١/ ل١٨٥" ا.ر. جب: س.پ، ل١٧٣" سعداوی: التاریخ الحربي، ل١٢٥.

یەکخستنەوەی هێزە ئیسلامیەکان لەناوچەی شام، بەتایبەتی پاش کۆچی دوایی (نورالدین محمود) کە (الملك الصالح اسماعیل)ی کوڕی بوو بەجێ نشینی[69]، بەڵام ناوبراو توانای پڕ کردنەوەی ئەو شوێنە گەورەیەی نەبوو، بووە یەکێ لەهۆیەکانی تێکچوونی شیرازەی جیهانی ئیسلامیو ناوچەی شام، هاوکات نەبوونی پیاوێکی شیاوو هەڵکەوتوو بۆ گرتنە دەستی جڵەوی لێپرسراوێتی تاوەکو سوڵتان سەلاحەددین سەری هەڵدا وەکو سەرکردەیەکی شیاوو لێهاتوو بۆ سەرکردایەتی جیهانی ئیسلامی بەگشتیو ناوچەی شام بەتایبەتی[70]، ئەوەبوو بەکۆتایی هێنانی دەسەلاتی خەلیفەی فاتمی لەمصردا ساڵی (٥٦٧ك/١١٧١ز) سەلاحەددین کورسیی وەزارەتی لەمصر وەرگرت، بووە دەسەلاتداری یەکەم لەم ولاتەدا و بەڕێوەبردنی مەملەکەتەکەی گرتە دەست[71]، ولاتانی (النوبە و برقە و طرابلس الغرب والحجاز والیمن) کەپێشتر باسمان لێوە کردن خستە ژێر رکێفی خۆیو، وای لێهات دەریای (القلزم) سوور هەموو کەوتە ژێر سەرکردایەتیو دەسەلاتی، هەروەها پاش کۆچی دوایی (نورالدین محمود) و لەئەنجامی پەشێوی شامدا، سوڵتان سەلاحەددین توانی دیمەشقو حەلەبو هەموو ولاتی شام بخاتە ژێر ئالای دەوڵەتە بەرفراوانەکەی خۆیەوە[72]، بەمەش توانی ئامانجە دەروونییە ستراتیژییەکەی، لەیەکبوونی جیهانی ئیسلامی بەئەنجام بگەیەنێ کەبریتی بوو لەولاتی شامو هەندێك لە

---

٦٩ابن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٢٤٣" ابن شداد: س.پ، ل٥٤" ابن واصل: س.پ، ج٢/ ل١" النويري: س.پ، ج٢٨/ ل٣٧٤.

٧٠ ابن شداد: س.پ، ل٥٦-٥٧" قاسم: ماهيه الحروب الصليبية، ل١٤٢.

٧١ ابن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٢١٧" القوصي: تاريخ دولة الكنوز الاسلامية، ل٦٣.

٧٢ ابو شامة: الروضتين، ج١/ ل٢٣٤" ايليسيف: الشرق الاسلامي في العصر الوسيط، ل٢٤٥-٢٤٦" گروسيه: الحروب الصليبية، (صراع الشرق والغرب)، ل٧١..

دەڤەرەکانی (الجزیره الفراتیه)و (الیمن، مصر ،النوبه ، الحجاز ، برقة و طرابلس الغرب)، پاش ئەوەی ئاوات و هیوای ئەم یەکێتییەی بۆ چووە سەر و پایەکانی لەجیهانی ئیسلامیدا چەسپاند کەخۆی لەخۆیدا گەورەترین کاریگەری هەبوو لەرزگارکردنی قودسدا[٧٣] ، کەخاچ دروشمەکان بۆ ماوەی نزیکەی (١٠٠) سەد ساڵ فەرمانڕەواییان تیادا دەکرد، سەلاحەددین توانی لەژێر ئالای جیهادو کارکردن لەپێناوی رزگارکردنی قودس‌دا ئامانجە دەروونییە ستراتیژییەکانی جێبەجێ بکات، هەرچەندە سوڵتان زۆر گرنگی بەگێڕانەوەی یەکێتی نێوان مصرو شام دەدا و چەند لەتوانایدا هەبووبێت بۆ گێڕانەوەی بەشەکانی تر لە وڵاتانی ئیسلامی هەوڵی دەدا[٧٤] ، ئەوەندەش پێویستی بەپشتگیری خەلافەتی عەبباسی زیاتر هەبوو، لە (نورالدین محمود) هەرچەندە هێزێکی سەربازی گەورەی هەبوو لەوشکانی و دەریا کەبەهیچ شێوەیەك لەگەڵ هێزی (نورالدین محمود)دا بەراورد نەدەکرا، چونکە دوژمنانی (نورالدین محمود) لەموسڵمانان نەبوون، بەڵام سەلاحەددین جگە لەخاچ دروشمەکان میرە موسڵمانەکانیش (بەتایبەتی زەنگییەکان)[٧٥] دژی بوون، هاوکات ئیسماعیلییەکان[٧٦] زۆر جار لەگەڵ خاچ

---

٧٣ گروسیه: س. پ، ل٧٢" سعداوي: التأریخ الحربي، ل١٧٣.

٧٤ نوری. سیاسة صلاح الدین، ل٢٥٧.

٧٥ زەنگیەکان: دەگەڕێنەوە سەر (زنکی بن اق سنقر بن عبدالله بن الترغان) لەهۆزی "ساب یو"، ناوبانگیان دەگەڕێتەوە بۆ باوکیان کەبە (قسیم الدوله) ناسرابوو، پیشەی (دەرگاوان – الحاجب) بوو لای سوڵتان (ملکشاه ی سلجوقی) هاوکات رۆڵی کاریگەری لەسەر رووداوە سیاسی و سەربازییەکانی دەوڵەتی سلجوقی هەبووە لەو سەردەمەدا. (ابن الاثیر: الباهر، ل٤" خلیل: عمادالدین زنکی، ل٣١ " زامباور: معجم الانساب والاسرات الحاکمة فی التأریخ الاسلامي، ترجمة: زکی محمدحسن واخرون، ج١/ ل١١٥).

دروشمەكان بۆ دژایەتی كردنی پرۆسەو بەرنامەكانی سەلاحەددین هاوكار بوون[77]، بۆیە دەبینین یەكێك لەو كاروبارانەی سەلاحەددین لەم كاتەدا كردی ئەوەبوو نێردراوی بەنامەیەك نارد بۆ لای خەلیفەی عەبباسی (المستضئ بأمر الله) و تێیدا باسی لەكردەوەكانی خۆی لەجیهادكردنی دوژمنو ڕزگاركردنی (مصر و الیمن و افریقیه) دەكرد كە مەترسیان لەسەر خەلافەت لەبەغدا هەبوو[78]، هەروەها خوێندنەوەی وتار بەناوی خەلیفەی عەبباسییەكانو داوای لێكرد بەڕەسمی دانی پیّدا بهێنن، فەرمانڕەوایی (مصرو برقە و الیمن والشام)و هەموو ویلایەتەكانی (نورالدین محمود)

---

٧٦ (ئیسماعیلییەكان): پێكهاتەی ئەم كۆمەڵە بریتییە لە پێكهاتەیەكی نهێنی بەسەرۆكایەتی "داعی الدعاه" بەناوی "شیخ الجبل"، قەڵای (الموت) یان كردبوو ناوەندێك بۆ بانگەشەكەیان لەنێو ساڵانی (٤٨٣ك-١٠٩٠ز/٦٥٤ك-١٢٥٦ز) ( Ency. De islam (Arat Alamut) vol .1, pp. 364 - 365.)، لەدوای (شیخ الجبل) بەزەنجیرە (كبار الدعاه) واتە گەورەی بانگەش كەران، پاشان (الدعاه العاملون) دەهات، هەروەها (الفدائیون) كەهونەر پیشەیان كاری تیرۆر بوو، كەبەردەوام لەخۆئامادەكردن دابوونو چاوەڕوانی فەرمانی (داعی الدعاه) یان دەكرد ئەگەر خۆ خستنە خوارەوەش بێت لەسەر لوتكەی چیاكان، هەروەها بەهیچ شێوەیەك دوانەدەكەوتن لەتیرۆركردنی دوژمنەكانیان بەخەنجەر ئەگەر مەسیحی بێت یان موسڵمان. هەرێمی (الجبل) بەدرێژایی كەنارەكانی (اللاذقیة و طرابلس) یان كردە شوێنی نیشتەجێ بونیان كە بە (جبل لبنان) ناسراوە، ئەمەش سنووری سروشتی نێوان وڵاتی موسڵمانانو خاچ دروشمانە، لەسەردەمی (سنان) نزیكەی (١٠) دە قەڵایان تێدا دروست كرد، بێگومان لەسەردەمی خاچ دروشماندا ڕۆڵێكی گەورەیان هەبوو لەمێژووی ڕۆژهەڵاتدا، و كاریگەریان لەسەر ڕێ ڕەووی ڕووداوەكان هەبوو(حتي: تاريخ سوريا ولبنان و فلسطين، ج٢/ ل٣٤٦" غالب: تاريخ الدعوة الاسماعيلية، ل٢٤" غالب:اعلام الاسماعيلية، ل٢٩٩).

٧٧ القزاز: الحياة السياسية في العراق في العصر العباسي الاخير، ل٢٥٦-٢٥٧.

٧٨ رفعت: معالم تاريخ العصور الوسطى، ل١٦٦.

دەکات، ئەوە بوو خەلیفەی عەبباسی دانی بەکارەکانی هێناو، دیارییەکی زۆریشی پێشکەش بەنوێنەرەکانی سوڵتان کرد[79].

جەنگی دەروونی ستراتیژی بۆ گەیشتن بەئامانجەکانی بەکاردێت و هەوڵدەدات بۆ قۆستنەوەی شکستو شکاندنە سەربازییەکان لەبەرەکانی جەنگو ئاشکراکردنی تێکچوونی باری ئابووریو داراییو تێکشکاندنی ورە لەنێو ریزەکانی دوژمندا[80]، بۆ نمونە خاچ دروشمەکانو هاوپەیمانە

---

٧٩ بۆ نموونە لەساڵی (٥٧١ك/١١٧٥ز) سەلاحەددین لەگەڵ (الملك الصالح) ی ئەتابەکی حەلەب رێککەوت بەکشانەوە لەگەمارۆی حەلەب بەمەرجێك حەلەبیەکان لەگەڵ لایەنی سێهەم رێك نەکەون بەبێ رازی بوونی لایەنی دووەم، بەڵام (سیف الدین غازی) ئەتابەکی موسڵ نووسراوێکی بۆ (الملك الصالح) رەوانەکردو هانی دا بە هەڵوەشاندنەوەی ئەورێکەوتنامەیەی نێوانیان، ئەمەوایکرد سوڵتان سەلاحەددین لەدژیان شەڕ راگەیەنێ، بەڵام پێش دەسپێکردنی شەڕەکە، نووسراوێکی بۆ خەلافەتی عەبباسی نارد و لەراستیی رووداوەکان ئاگاداری کردەوە، ئەویش بۆ روونکردنەوەی رێککەوتنی لەگەڵ (الملك الصالح) کەسەربازەکانی بۆ جیهادی خاچ دروشمەکان ئامادەبن، بەڵام (سیف الدین غازی) وای لێکرد لەپەیمانەکەی پەشیمان ببێتەوە، بۆیە داوا لەخەلیفەی عەبباسی دەکات کە ئاگاداریان بکاتەوەو مافی شەڕکردن بە سەلاحەددین لەدژیان بدات، ئەگەر بێتو ئەوان لەسەر ئەو حاڵەتە بەردەوام بن، و سەلاحەددین بەشەڕی موسڵمانان و بەجێ هێشتنی جیهادی خاچ دروشمەکان تاوانبار نەکرێت، چونکە یەکێتیی موسڵمانانی دەوێت. (القاضي الفاضل: عبدالرحيم البيساني، رسائل القاضي الفاضل، مخطوطة حسين بك، مكتبة اوقاف الموصل رقم ٩/١، ورقة ٩). بڕوانە دەقی نووسراوەکەی سەلاحەددین کەڕەوانەی خەلیفەی عەبباسی "المستضئ بأمر الله"ی کرد لە ساڵی( ٥٧١ك/١١٧٥ز)، لە پاشکۆی ژمارە (١). (ابن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٢٥٩" ابن شداد: س.پ. ل٤٢" العسلي: صلاح الدين، ل١٩٧).

٨٠ زناد: الحرب النفسية، ل ١٥.

(جنەوییەکان) [81] لەئەنجامی سەر نەگرتنی پیلانەکەیاندا لەدژی سوڵتان سەلاحەددین تووشی شکستو نائومێدیەکی گەورە بوون، [82] دوای ئەوەی لەمەترسی چالاکیەکانی بۆ یەکخستنی موسڵمانان لەمصرو شام بەئاگاهاتن، بەتایبەتی هەوڵەکانیان بۆ نزیك بوونەوە لە (الملك الصالح اسماعیل) پێش مردنی، ئەمە جگە لەخۆ نزیك کردنەوە لەهەندێ هێزی نەیاری ناوچەکە دژ بە سەلاحەددین [83]، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەتاچەند تووشی بێ ئومێدی بوون بۆ سەلماندنی راستی ئەم بۆچوونە ،(ولیم

---

٨١جنوە:بەندەرێکە لە ئیتالیا، دەکەوێتە سەر کەنداوی جنوە، کە بەشێکە لە دەریای ناوەڕاست.(المنجد في اللغه والاعلام، ل٢٠٥).

٨٢خاچ دروشمەکان و هاوپەیمانە جنویەکانیان دڵگران و نائومێدبوون لە کار و چالاکیەکانی سولتان سەلاحەددین بۆ یەکخستنی جیهانی ئیسلامی، بەمەیش ترس و دڵەڕاوکێ باڵی بەسەریانداکێشا، کە دڵنیابوون لە کەسایەتی سوڵتان و سوربوونی لە سەر دەرکردنیان لە رۆژهەڵاتی ئیسلامی، ئەمەش خۆی کاریگەری دەروونی خراپی هەبوو لەسەر بەرژەوەندییە ئابوریەکانیان، چونکە ئەوان لەسەردەمی دەوڵەتی فاتمیەکان سودبەخش بوون لەڕێگەی پەیوەندیە بازرگانیەکانیانەوە لەگەڵ شام و مصردا ، کە بەهۆیەوە سەروەت و سامانێکی زۆریان کۆکردەوە لە سەربازگەی (موسوڵمانان و خاچ دروشمەکان) بۆیە سەیر نیە کە خاچ دروشمەکان و هاوپەیمانە جنەویەکانیان لەگەل هێزە نەیارەکان پیلان داڕێژن لە دژی سوڵتان سەلاحەددین، نەك بۆ خۆشەویستی ئەم هێزانە بەڵکو بۆ پاراستنی بەرژەوەندیە ئابوریەکانیان و کۆنترۆڵکردنی و ولاتی مصر کە پێی دەوترا (گەنجینەی هەموو زەوی)، (الکناني: العلاقات بين جنوه والشرق الادنى الاسلامي، ل١٤٢-١٤٣).

٨٣ کە پێکاتبوون لە چەند کۆمەڵەیەك، جگە لە میرەکانی دیمەشق و حلب کە سەر بە (الملك صالح اسماعيل) بوون، و کۆمەڵەی (سیف الدين غازي ابن قطب الدين مودود بن زنكی)، و کۆمەلەی (قلیج ارسلان) و لایەنگرانی لە ئاسیای بچوکدا، دوا کۆمەڵەش پاشماوەی فاتمیەکان بوو.( الکنانی: س.پ، ل١٤٥" گروسیه: س.پ، ل٧٢).

الصوری)[84] باس لەو دوو دڵی و پەشێوییەی کە تووشی خاچ دروشمەکان و جەنەویەکان هاتبوو دەکات و دەڵێ: "لەگەڵ هەموو هەوڵەکانماندا بۆ بەرەنگار بوونەوەی سەلاحەددین، بەڵام هەر شکستمان هێنا، ئەمڕۆ ترس لەهەموو لایەکەوە دەوری لێداوین، لەدەریاو، وشکانییەوە، وەکو یەك، مەترسیەکانی ئەوەندە پەرەی سەند هەرکاتێك هێرش بکاتە سەرمان، توانای بەرگری کردنمان نابێت، بۆیە چاکتر وایە دەستی یارمەتی بۆ (الملك الصالح اسماعیل) درێژ بکەین، نە بۆ خۆشەویستی (الملك الصالح اسماعیل)و نەبۆ چاکەی (حلب)و میرو خەڵکەکەی بوو، بەڵکو بۆ بەربەرەکانی کردنی سەلاحەددین و ڕێ لێگرتنی لەپێش جێبەجێکردنی پلانەکەیدا کە (کارکردنە لەپێناو ڕزگارکردنی قودس)، بەمەش هێرشەکەی بۆ سەر قودس لاواز دەبێت"[85].

ڕەنگە مەبەستی (ولیم الصوری) لەم ئاماژەیە، ئەوە بێت کەخاچ دروشمەکان هەوڵ و کۆششیان لەپێناو کۆسپ خستنە ڕێگەی سەلاحەددین دا لەیەکخستنی بەرەی ئیسلامی دا بەهاندانی فاتمیەکان و بەهاوکاری جنەویەکان و خاچ دروشمەکان بووبێت کە سەلاحەددین هەر لەسەرەتاوە دەستی بەسەریاندا گرتبوو، دوای نوچدانی پیلانەکەیان هەوڵ و چالاکییەکانی سەلاحەددین پەرەی سەند بۆ یەکخستنی بەرەی

---

٨٤ (ولیم الصوری): یەکێك بوو لەمێژوو نووسە گەورەکانی خاچ دروشمەکان، لەساڵی (٥٢٦ك/١١٣٠ز) لەشاری (قوص) لەدایك بووە، چەندین پلەو پایەی گرنگی وەرگرتووە، لەوانە سەرۆکی شەمامسیەی شاری صور بووە، و لە ساڵی (٥٨٠ك/١١٨٤ز) دا راوێژکاری مەملەکەتی خاچی بوو لەشاری قودس. (العرینی: مؤرخو الحروب الصلیبیة، ل١٠١-١٠٣)" و نێردراوی (امالریك) بووە بۆ لای (مانویل)ی ئیمپراتۆری بیزنطی ساڵی (٥٦٤ك/ ١١٦٨ز) بۆ گرتنی وڵاتی مصر. (رنسیمان: س.پ، ج٢/ ل٦١٢).

٨٥ الحروب الصلیبیة، ج٤/ ل ١٨٤-١٨٥.

ئیسلامی لەمصرو شام،[86] لەچوارچێوەی ئامانجە دەروونییە ستراتیژییەکانی دا، پاشان ڕووی کردە قۆناغی دووەم ئەویش جیهاد بوو دژی خاچ دروشمەکان کەبەشێك لە (لبنانو سوریا)و هەموو قودس یان داگیر کردبوو، سەلاحەددین لەجەنگەکانیدا نمونەی فەرماندەیەکی کارامەو دووربینو لێزان بوو، هەرگیز خۆی بەشەڕی لاوەکییەوە خەریك نەدەکرد، بەڵکو بەهەموو توانایەکییەوە رووی دەکردە ئامانجە دەروونییە ستراتیژییە سەرەکیو بنچینەییەکان، هەروەها گرنگترین هەڵوێستو دڵسۆزی پڕ لەدانایەتیو دووربینی پیادەکرد بەرامبەر بەخەلافەتی عەبباسی لەبەغدا[87]، بێگومان سوڵتان سەلاحەددین لەو کارەی ئامانجی دەروونی ستراتیژی هەبوو لەبەر ئەوەی خەلافەت رەمزی یەکێتی موسڵمانەکان بوو، تاکو ئالای یەکێتیو یەکبوونی ئیسلامی هەر بمێنێتەوە، هێنانە دی ئەم یەکێتیە گەورەترین رۆڵی هەبوو لەرزگارکردنی ناوچە داگیرکراوەکاندا، بێگومان ئەو سەرکەوتنانەی سەلاحەددین بەدەستی هێنا لەئەنجامی ئەو یەکێتییە بەهێزە بوو کەلەژێر سایەی ئەو دروست بوو[88]، هاوکات بەرزکردنەوەی دروشمی کارکردن لەپێناوی رزگارکردنی قودسو گەڕانەوەی شکۆمەندی دەوڵەتی عەبباسیو زیندووکردنەوەی بنەماکانی جیهاد لەپێناوی خودادا دژی بێ باوەڕەکان لەهەموو شوێنێك[89]، نزیکەی ساڵی (٥٨٢ك/ ١١٨٧ن)

---

٨٦ العماد الکاتب: الفتح القسي، ل١٧–٢٥" ابن شداد: س.پ، ل٢١–٢٣" ابن واصل: س.پ، ج٢/ ل١٤٨، ١٥٧، ١٨٥" یوسف: الوحدة وحرکات الیقظة العربیة ابان العدوان الصلیبي، ج٤/ ل٢٨.

٨٧ مصطفی: صلاح الدین، ل٩٩" نوري: الفکر العسکری للقائد صلاح الدین الایوبی، مجلة المورد، العدد ٤، ل٧٠.

٨٨ القلقشندي: صبح الاعشي، ج٣/ ل٨٥.

٨٩ مصطفی: س.پ، ل١٥٤" نوری: الفکر العسکری، مجلة المورد، العدد٤، ل٧١.

سەلاحەددین لەزامنکردنی سنووری دەوڵەتە پان و بەرینەکەی بووەوە، هەروەها بەگونجاوترین ڕێگەو شێوازی لەبار ڕاهێنان و مەشقی بەسوپا و هێزەکەی تەواوکردو پڕ چەکی کرد، بە شێوەیەك سوپاکەی یەکخست کە بۆ شەڕکردن لەگەڵ خاچ دروشمەکاندا بگونجێت،[90] موسڵمانەکان لەسەرەتای شەڕەکانی خاچ دروشمەکاندا لەبەر نەزانین و ئاگادار نەبوونیان بەهەل و مەرجی هێزەکانی خاچ دروشمەکان شکستیان دەهێنا. بەلام پاش تەواو بوونی قۆناغی یەکەمی شەڕەکە، سەلاحەددین شارەزای هەموو ئەو شێوازانە بوو کە لای خاچ دروشمەکان هەیە و پلانێکی ستراتیژی دوورمەودای داڕشت و پاش ئەوە شەڕی لەگەڵ کردن و بەسەریاندا سەرکەوت[91]، هەمیشە سەلاحەددین لەڕووی دەروونی ورەیی سەربازەکانی ئامادە دەکرد، و گیانی مەعنەوی بەرز دەکردنەوەو گرنگی دەدا بەلایەنی هۆشیاری لەنێوانیانداو ئەوەی بۆ روون ئەکردنەوە کەئەو میرنشینانەی خاچ دروشمەکان لەشامدا دایان مەزراندووە ولاتی ئەوانەو زەوت کراوەو ئەبێت بۆیان بگەڕێتەوە[92]، ئەمەش بۆ خۆی لەهۆشیارکردنەوەی هێزەکەیدا کاریگەریی دەروونی گەورەی لەسەر ورەی موسڵمانان بەجێ هێشت[93]، سەلاحەددین پێی لەسەر فاکتەری ئایینی بۆ شەهید بوون لەڕێگەی خودا دائەگرت و فەرمانی دەرکرد بۆ ئەوانەی کەلەناو سوپادا ئامۆژگەرو گوتار بێژن کەئەو پاڵنەرە لەدەروونی سەربازەکاندا بەهێز بکەن، چونکە سەردەمی سەلاحەددین زیاتر ڕوویەکی جیهادی هەبووە، بەیەکێکیش لەبنچینە

---

٩٠ ایلیسیف: س.پ، ل٤٦٥“ المعاضیدي: الوطن العربي والغزو الضلیبي، ل١٦١.

٩١ زمانی: بحوث حول النظام العسکری فی الاسلام، ل١٣٤.

٩٢ ابو شامة: الروضتین، ج٢/ ل٧“ سعداوی : التاریخ الحربي، ل١٧٣“ عاشور: الحرکة الصلیبیة ج٢/ ل٨٠٠.

٩٣ حمزة: ثلاث شخصیات فی التاریخ، ل٢٨٢.

ستراتیژییەکانی ئەیوبییەکان دائەنرا لەپەیوەندییە دەرکیەکاندا، لەو شەڕو مامەڵە کردنانەیاندا کەلەگەڵ خاچ دروشمەکان هەیان بوو[٩٤]، کاریگەریی شەڕەکانیش زیاتر رەگەزێکی جیهادی هەبوو یارمەتی دەرو بزوێنەری راستەقینەو پاڵنەرێکی سەرەکی سوپای ئەیوبی بوو، چ لەسەر ئاستی تاکە کەس و چ لەسەر ئاستی سەرکردایەتی بۆ ئەوەی جیهاد ببێتە چەقی بیری ئیسلامی لەمامەڵە کردن لەگەڵ ئەوانی تردا... سەربارى ئەمەش سەلاحەددین دەرکی کردبوو بەوەی جیهاد گەنجینەیەکی شۆڕشگێڕانەیەو توانای جوڵاندنی گەلانی موسڵمانی هەیە لەکاتی مەترسیەکاندا، بەتایبەتی مەترسی خاچ دروشمەکان[٩٥]، هەروەها باس کردنی بەسەرهاتی پێشینە چاکە خوازەکانی لەم ڕێگایەدا تاوەکو سەربازەکان لەلوتکەی رازی بوون و بەختەوەریدا خۆیان لەپێناو پەروەردگاردا بکەنە قوربانی و ئەو کات دڵنیان لەوەی دوای شەهید بوونیان بەهەشتێك چاوەڕوانیانە[٩٦]، وەکو لەم ئایەتەدا هاتووە:

{وَسَارِعُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ}[٩٧]، بێگومان ئەمە ئامانجێکی دەروونی ستراتیژی بوو لای سەلاحەددین بۆ ئەوەی حاڵەتێکی دەروونی لەنێو ریزی سەربازەکانیدا بخولقێنێ و وورەیان بەرز بکاتەوە بەهەموو توانایەکی سەربازییەوە بۆ

---

٩٤ یوسف: العرب والروم واللاتین، ج١/ ل٩٤.

٩٥ ابن شداد: س.پ، ل٤٨" ابوشامة: الروضتین، ج٢/ ل٢٢١-٢٢٢" یوسف: العدوان الصلیبي علی مصر، ج٢/ ل٤٢.

٩٦ شدید: الجهاد في الاسلام، ل٩٠-٩٣.

٩٧ (پەلە بکەن بۆگەیشتن بەبەخشینی پەروەرێنتان و بەهەشتی کەهەراوی بەئەندازەی ئاسمانەکان و زەوینە و سازکراوە بۆ ئەوانەی لەخواترسن). سورەتی ال عیمران: ئایەتی ١٣٣، وەرگێڕانی مامۆستا هەژار.

بەگژاچوونی خاچ دروشمەکان ئامادەیان بکات، ئامانجی ستراتیژی سەلاحەددین لەشەڕەکاندا گێڕانەوەی هەموو ئەو زەویانە بوو کە خاچ دروشمەکان داگیریان کردبوون لەکۆتایی سەدەی (٥ك/١١ن)و لەپێناوی جێبەجێکردنی ئەم ئامانجەدا، سەلاحەددین جۆرەها شێوازی گرتەبەر لەڕێگەی ڕوو بەڕووبوونەوەی راستەوخۆ لەگەڵ دوژمن، یان لاوازکردنی لەڕووی ئابوورییەوە، و ئیفلیج کردنی ورەیان و ئابلۆقە دانیان لەخاڵی راگیربوون کەخۆیانیان پێ بەهێز کردووە، هاوکات سەلاحەددین جۆرەها تەکتیکاتی گرتەبەر بۆ ئەوەی خاچ دروشمەکان بکەونە داوییەوە[٩٨]، لێرەوە دەرئەکەوێت کە سوڵتان سەلاحەددین لەبەڕێوەبردنی دەوڵەت و سەرکردایەتی کردنی سەربازەکانیدا دژ بەخاچ دروشمەکان ئامانجی دەروونیی ستراتیژی هەبووە، لەقۆناغی یەکەمدا سەلاحەددین هەوڵیدا هێزە موسڵمانەکان لەژێر ئالای سەرکردایەتی خۆیدا یەکبخات، پاش ئەوەش قۆناغی دووەم کەجیهادە دژ بە خاچ دروشمەکان دەستپێکرد.

بێگومان سەرکەوتنی هەر سەرکردەیەك بەندە بەتوانای لە هەڵبژاردنی شوێنێکی گونجاو بۆ سوپاکەی لە کاتی جەنگدا، بەشێوەیەك ساغ و سەلامەتی سوپاکەی مسۆگەر بکات، بەم جۆرە سەلاحەددین مەبەستەکانی بەکارهێنانی جەنگی دەروونیی ستراتیژی لەم شەڕەدا دژ بە خاچ دروشمەکان پراکتیزە کرد، بێگومان سوود وەرگرتن لە هەڵەکانی دوژمن بەشێکە لە ستراتیژیەتی فاکتەر کە زۆرجار فەرماندە سەربازیەکان لە میانەی ئەو هەڵانەوە پیلانی دائەڕشت[٩٩]، بۆیە لێرەدا دەتوانین بڵێین ئامادەیی و خۆسازدان لە پێناو ترساندنی دوژمندا، خۆی لەخۆیدا جەنگی

---

٩٨ حسین: س.پ، ل٢٠٦.

٩٩ الخلفات: العسكرية الاسلامية وقادتها العظام، ل٥٩.

دەروونــی ســتراتیژییە، لــەم بارەیــەوە خــوای گــەورە لــە قورئــانی پــیرۆزدا دەفەرمویت: {وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِنْ دُونِهِمْ لا تَعْلَمُونَهُمُ اللَّهُ يَعْلَمُهُمْ وَمَا تُنْفِقُوا مِنْ شَيْءٍ فِي سَــبِيلِ اللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنْتُمْ لا تُظْلَمُونَ} [١٠٠].

بێگومان ئەوپیلانە دەروونییە ستراتیژییەی کە سوڵتان سەلاحەددین دای ئەڕشت و ئاراستەی دەکرد، ڕاستەوخۆ کاری دەکردە سەر خاچ دروشمەکان ولەهێزو توانای سوپای دەوڵەتی ئەیوبی دەترسان، هەرچەندە ژمارەیان زۆر بوو، خاوەن سێ میرنشینی خاچیش بوون لە ڕۆژهەلاتی ئیسلامیدا و جگە لەتوانا ماددیو سەربازییەکانیان، لەگەڵ سوود وەرگرتن لەهەڵەکانیان، بۆیە دەتـوانین بڵـێین چـاکترین دەسـکەوتی ئـەم جەنگـە دەروونییـە بـۆ سـوڵتان سەلاحەددین بلاوبوونەوەی تواناو لێهاتوویی ئەم سەرکردەیە بوو، هاوکات لەگـەڵ بـالا بـوونی ناوبـانگی لەچوارچـێوەی جیهـانی ئیسلامی بـۆ ولاتـانی ئەوروپا.

١٠٠ واتە (تا بۆو دەکرێ چەكو جبەخانەی شەڕو ئەسپی سواری پەیدا بکەن" دوژمنـی پـێ بترسـێنن، کـە دوژمنـانی خوداشـن. غـەیری وانـیش دوژمنو هـەن نایـان ناسـن، بـەلام خودا دەیان ناسێ. هەر ماڵێکی لە ڕاهی خودای بەخت بکەن، خودا دەیبژێرێتـەوەو هـیچ ناهەقی قبوڵی ناکرێ). (سورەتی ئەنفال: ئایەتی ٦٠، وەرگێڕانی مامۆستا هەژار).

## جەنگی دەروونیی تەکتیکی

جەنگی دەروونیی تەکتیکی بەجەنگی مەیدانی یان جەنگی کورت خایەنیش ناودەبرێت کە لەبەرەکانی جەنگدا ئاراستەی ڕێکخستنەکانی دوژمن دەکرێ و تایبەتە بە ناوچەیەك یان بەرەیەکی جەنگیی دیاری کراو، مەبەستیش لەم شێوازە لاواز کردنی ورەی کەرتەکانی ئەو بەرەیەیەو ئامانجیش لێی خۆبەدەستەوەدانی دوژمنە، [1] هەروەها ئەم جۆرە جەنگە دژی ئەو مەدەنیانە بەرپادەکرێ کە دەکەونە ناوچەی چالاکییە سەربازییەکان و ڕازیکردنی دوژمن بەوەی کە ئەو مەسەلەیە لە پێناوی جەنگدا دەیکەن مەسەلەیەکی ڕەوا نییەو بۆ دروست کردنی گومان لە نێوان سەربازو سەرکردەکانی دوژمن و لاواز کردنی ورەیان[2]. لەژێر ڕۆشنایی ئەم پێناسەیەدا سوڵتان سەلاحەددین توانی یەکەم جەنگی دەروونیی تەکتیکی ئاراستەی سەربازانی سودان بکات، کاتێك ئەم سەربازانە بەهۆی کوشتنی فەرماندەکەیانەوە (جوهر بن عبدالله)ی موئتەمەنی خەلافەت هەڵگەڕانەوە، و کۆبوونەوە بۆ شەڕی ئەیوبییەکان و نزیکەی (٥٠) هەزار سەرباز دەبوون، شەڕ لە نێوان هەردوو لادا بەگەرمی بەرپا بوو، بە سەرکەوتنی سەلاحەددین و دۆڕاندنی سودانیەکان کۆتایی هات[3]، کاتێك سوڵتان فەرمانی‌دا بە سووتاندنی گەڕەکەکەیان کە بە (المنصورە) [4] ناسرا بوو

---

١ الدباغ: علم النفس العسكري، ل١٧٩" السيد: اضواء على الحرب النفسية، ل٤٣" علي: معركة الكلمة، ل٦٨.

٢ حاتم: س.پ، ل١٨٧" زناد: س.پ، ل١٥.

٣ أبن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٢٠٣-٢٠٤" أبن خلدون: تاريخ أبن خلدون، ج٥/ ل٢٨٢" ابن تغري بردي: س.پ، ج٦/ ل٧١" العسلي: صلاح الدين الايوبي، ل٩٢" غنيم: الدولة الايوبية والصليبيون، ل٢٢.

٤ (المنصورة): گەڕەکی (المنصورية)، دەکەوێتە دەرەوەی دەرگای (زويلە)، لای ڕاستی، گەڕەکێکی زۆر بەر بڵاو بوو. سودانیەکان لەو گەڕەکە نیشتەجێ بوون، پاش ئەو ڕووداوەو لەسەر فەرمانی سوڵتان

نزیکـی (باب زویلـه)[٥] و (تورانـشاه)ی بـرای سـەلاحەددین بـەهێزی شمـشێر توانی لە قاهیرە شـار بەدەریان بکاتو لە شـاری (جیـزە) نیشتەجێ کران[٦]، ئامانجی سەلاحەددین لەو کارە کۆتایی هێنـانی ملمـلانـێو پاڵنـانیـان بـوو بـۆ حاڵـەتێکی دەروونـی خـراپو خـۆ بەدەسـتەوەدان و مـل کـەچ بـوون بـۆ مەرجـەکانی، بـۆ سـەلماندنی ئـەم بـۆ چـوونە (الجبرتـی) دەڵێـت: (خەلیفـە العاضد)[٧] "خۆی دانەری ئـەم پیلانـە بـوو لـە دژی سـەلاحەددین بەمەبەستی ڕزگار بوونیان لەدارودەستەی سوڵتان لە وڵاتی مصر".[٨]

تاکتیـك مانـای هونـەری جەنگـە لـە گۆڕەپـانی شـەڕدا کـە لـە پێنـاو لاواز کردنـی دوژمــن پیــادە دەکرێــت یــا ڕاســتەوخۆ گەیــشتن بــە ئامانجــە دیاریکراوەکان و بەردەوام بوون لەم کارەدا دوژمن ماندوو دەکات و تووشـی دۆخێکــی شــڵەژاوی دەکــات،[٩] بێگومــان تــاکتیکی ســەرکەوتوو دوژمــن

---

سـەلاحەددین لەلایـەن مـیر (خطـاب بـن موسـی) وێـران کـرا، و دانیـشتوانەکەی ڕاگـوێزکران بـۆ ناوچـەی (الصعید)، پاشان شوێنەکیان بوو بە باخ. (یاقوت الحموي: س.پ، مج٤/ ل٣٣٠).

٥ (باب زویلة): یەکێکە لەچوار دەرگاکانی شاری (القاهرە)، کەوا سەرکردە (جوهر) لەگەڵ دروست کردنـی شارەکە درووستی کردوون، بەناوی یەکێك لە هـۆزە بەربەرییـەکانی ڕۆژئاوا کـە لەگەڵیدا بوون، و لـە سـاڵی (٤٨٥ك/١٠٩٢ز) دەرگای (زویلە)ی گەورە لە لایەن میری سوپا (بدر الدین الجمالي) دروست کراوە، هاوکات یەکێك بوو لەدەرگا بەهێزەکانی ئەم شارە. (القلقشندي: صبح الاعشی، ج٣/ ل٤٤٨-٤٤٩" مبارك: الخطط التوفیقیة، مج٣/ ل٢٣٦).

٦ ابن کثیر: البدایة والنهایة، ج١٢/ ل٣٤٤" أبن خلدون: تاریخ أبن خلدون، ج٥/ ل٢٨٣" المقریـزي: اتعاظ الحنفاء، ل٣٦٣" الخطط، ج٢/ ل١٩" ا.ر. جب: صلاح الدین الایـوبي، ل١٢٠" عاشـور: الحرکة الـصلیبیة، ج٢/ ل٧٠٧-٧٠٨.

٧ (خلیفـة العاضـد) نـاوی (عبـدالله بـن یوسـف بـن حـافظ)، لـە سـاڵی (٥٥٠ك/١١٦٠ز) بووەتـە خەلیفـەی فاتمیـەکانو دواخەلیفەشـیانە، لـە سـاڵی (٥٦٧ك/١١٧١ز) کۆچـی دوایـی کـردووەو لـە قـاهیرە بـەخاك سپێردراوە. (أبن خلکان: س.پ، ج٣/ ل١٠٩).

٨ عجائب الاثار في التراجم والاخبار، ج١/ ل٤٩.

٩ عبد القادر: الاعلام والدعایة، ل٣٣٩.

دەترسێنێ و لاوازیشی دەکات، ئەم شێوازە بوو کە سوڵتان سەلاحەددین و فەرماندەکانی پیادەیان دەکرد[10].

سەرەڕای ئەوەی ئامانجەکانی جەنگی دەروونی یەك شتە، بەڵام هۆکارو کەرەستەکانی جیاوازی هەیە لەنێوان جەنگی دەروونی تاکتیکی و ستراتیژی، مەبەست لەم جەنگەکۆتایی هێنانە بە کێشەکان و پاڵ نانە بە دوژمن بۆ دروست کردنی حاڵەتێکی دەروونی، ئەویش حاڵەتی شکست و دۆڕاندنەو لەئەنجامدا خۆبەدەستەوەدانە بەلایەنی سەرکەوتوو، هەربۆیە دوای مردنی (نورالدین محمود) سەلاحەددین لەڕوودانی کێشەو گێرە شێوێنی و ناکۆکیەکانی وڵاتی شام بێ ئاگا نەبوو، بەڵکو زۆر بەهەستیارییەوە تەماشای ڕووداوەکانی دەکردو چاوەڕێی هەلێکی شیاوی دەکرد بۆ ئەوەی بچێتە ناویەوە، سەلاحەددین سیاسەتی وابوو نەیدەویست خەڵکی شام لەبەر چوونی بۆ ناو وڵاتەکەیان لێی هەڵسن و ڕاست ببنەوە و لەترسی ئەوەی نەوەکو دژیشی بوەستن و ئاستەنگ بخەنە ناو کارەکانیەوە بەردەوام نامەی بۆ پادشا (الملك الصالح اسماعیل) دەناردو ملکەچی و گوێڕایەڵی خۆی بۆ دووبارە دەکردەوە، لەدوای ئەمەش ترسی خۆی لەسەر بەرژەوەندییەکانی پادشا بۆ شامییەکان نیشاندا[11]، بێگومان هەر سەرکردەیەك لەو سەردەمەدا هەوڵی سەر لەنوێ بنیاد نانەوەی باری سیاسی بدابووایە، ئەوا دەبوایە بەخۆ ئامادە کردنەوە بەرپەرچی ئەو میرنشینە زەنگیانەی بدایەتەوە کە لەناوچەی شام و جەزیرەدا هەبوون[12].
بەتایبەتی لەلایەن ئەو کەسانەی باوەڕیان وابوو ئەوان مافی جێگرتنەوەی پادشای چاکە خواز (نورالدین محمود)یان هەیە ڕووبەڕووی ناڕەزاییەکی

---

١٠ حسين: الجيش الايوبي، ل٢٠٧.

١١ ابن الأثير: الكامل، مج٧/ ل٢٥١،٢٤٣.

١٢ ابن الأثير: الكامل، مج٧/ ل٢٢٤" أبوشامة: الروضتين، ج٢/ ل٢٨-٣٧" قاسم: س.پ، ل١٤٢.

توند دەبووەوە، لەڕووبەڕووبوونەوەکانی (أبن المقدم)[13] و (سعدالدین کمشتکین)[14] بۆ سەلاحەددین ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت[15].

سەلاحەددین لەکاتی شەڕکردن لەگەڵ دوژمنەکانیدا بەمەبەست دروشمی (شەڕ لە پێناوی خوادا) یان (کارکردن لەپێناوی ڕزگارکردنی قودسی) بەرز دەکردەوە کە پێشتر باسمان لێوە کرد[16]، وەکو لەم ئایەتەدا هاتووە {وَجَاهِدُوا فِي اللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِ}[17]، ئەمەش وەك هۆکارێکی دەروونی کاریگەر بۆ ئەوەی بتوانێت بچێتە شام و بێ هیچ نەیارێك فەرمانڕەوایی بکات، چونکە بەبێ ڕاگەیاندنی ئەو دروشمە و بەبێ بەکارهێنانی ئەو شێوازە تاکتیکیە دەروونییە و ئاگادار کردنەوەی لایەنە بەرپرسەکان بەوەی مەبەستیەتی دەنگەکان یەك بخات بۆ شەڕ کردن لەگەڵ خاچ دروشمەکانو ڕزگارکردنی قودس، نەیدەتوانی بەنووکی ڕم نەبێت بچێتە شامەوە، ئەگەر

---

١٣ ابن المقدم: ناوی (شمس الدین محمد بن عبد الملك)ە، یەکێك بوو لەگەورە میرەکانی (نورالدین محمود) پاشان سەلاحەددینی ئەیوبی، ڕۆڵی کاریگەری هەبوو لە شەڕی خاچ دروشمەکان، لە ساڵی (٥٨٣ك/١١٨٧ز) لەکاتی بەجێ هێنانی ئەرکی حەج کوژرا، کەمیری حاجیەکانی شام بوو، بەدەستی حاجیەکی عێراقی بەناوی (مجیر الدین طاشتکین). (ابن تغري بردي: س.پ، ج٦/ ل١٠٥، ابن العماد: شذرات الذهب، ج٤/ ل٢٧٦" الغساني: العسجد المسبوك والجوهر المحكوك في طبقات الخلفاء والملوك، ل٢٠١).

١٤ (سعد الدین کمشتکین): یەکێك بوو لەسەر لەشکرەکانی (نور الدین محمود)، لەسەردەمی ئەو والی موصلْ بوو، پاش (نورالدین محمود) بەرەو شاری (حلب) هەڵهاتو چووە خزمەتی (شمس الدین بن دایة) دواتر لەگەڵ (الملك الصالح)دا بوو قەڵای (حارم)ی دایە، لە ئەنجامی کارەکانی ساڵی (٥٧٣ك/١١٧٧ز) کوشتی. (أبن الآثیر: الکامل، مج٧/ ل٢١٥-٢١٧" أبن خلکان: س.پ، ج٧/ ل١٦٨" ابن تغري بردي: س.پ، ج٦/ ل٨١).

١٥ ابن الآثیر: الکامل، مج٧/ ل٢٥١" العسلي: صلاح الدین الایوبي، ل١٢١-١٢٢" العبدة: أیعید التاریخ نفسة، ل١١٧.

١٦ ایلیسیف: س.پ، ل٤٤٧" یوسف: العرب والروم واللاتین، ج١/ ل٩٥" مصطفی: س.پ، ل١٥٧.

١٧ واتە (بەدڵو داو- وەك پێویستە - لەڕێی خودا بچنە خەزا). (سورەتی حەج، ئایەتی ٧٨، وەرگێڕانی ماموستا هەژار).

بشـچووایە نەیـدەتوانی تیایـدا بمێنێتـەوە[١٨]، لەبـەر ئـەوەی ڕووبـەڕووی بەرهەڵستەیەکی توند دەبوەوە، بەڵام سەلاحەددین زانی چۆن ڕەفتار بکاتو چ پیلانێکی تاکتیکی بگرێتە بەر.

ئەوەی سـەلاحەددین چاوەڕێی دەکـردو هیـوای بۆدەخواسـت داواکردنـی بوو لەلایەن خەڵکی شامەوە،[١٩] ئەمەش بۆی بوو بە باشترین بەڵگە بۆ ئەوەی دەست لەکاروباری وڵاتیان وەربدات، ئەوە بـوو ساتێك دوا نەکەوت، بـەڵکو پەلـەی کـرد لەڕۆیـشتن، و مـصری بـەجێ هێـشتو گەیـشتە (بـصری)[٢٠] میرەکـەی پێشوازیەکی گـەرمی لێکـردو پاشـان ڕووی لـە دیمەشـق کـرد لـە مـانگی (ڕەبیعـی یەکـەمی سـاڵی ٥٧٠ك/١١٧٤ز) گەیـشتە نـاو دیمەشـق و چووە ناو خانووی باوکی کە بە (العقیقی)[٢١] ناسراوە، تاوەکو قەڵاکەیان دایە دەسـتی[٢٢]. پـاش ئـەوەی سـەلاحەددین کۆتـایی بـە ڕزگـارکردنی دیمەشـق هێنا، کاروباری ئەم شارەی ڕێکخستەوە کەلەپێشدا خراپیان کردبوو، ئینجا دایـە دەسـت براکـەی (سـیف الاسلام طغـتكين)[٢٣]، پاشـان بـای دایـەوە سـەر (حمص)، کۆنترۆڵی کرد تەنیا قەڵاکەی نەبێت[٢٤]، پاشان ڕۆیشت بۆ (حماه)[٢٥]

---

١٨ ابن الآثير: الكامل، مج٧/ ل٢٥٢" مصطفى: س.پ، ل١٥٣.

١٩ ابن الآثير: الكامل، مج٧/ ل٢٥٢" ابو شامة: الروضتين،ج١/ ل٢٣٦" ابن العديم: زبدة الحلب، ج٣/ ل١٥-١٨" ابن العبري: تاريخ مختصر الدول، ل٣٧٥" قەفتان: س.پ، ل٢٢٨.

٢٠ بصرى: شارێکە لە وڵاتی شام سەر بەدیمەشقە. (ياقوت الحموي: س.پ، مج١/ ل٣٤٨).

٢١ العقيقى: شوێنی (العقيقى) ئەمڕۆ لە (باب البريد) لە خانەی کتێبی (الظاهرية) لە دیمەشق. (مصطفى: س.پ، ل١٥٨).

٢٢ ابن الآثير: الكامل، مج٧/ ل٢٥١-٢٥٢" ابن واصل: س.پ، ج٢/ ل٢٠" المعاضيدي : س.پ، ل١٥٩.

٢٣ سيف الاسلام طغتكين: کوڕی (أيوب بن شادى)ە، نازناوی (الملك العزيز) بوو، پیاوێکی ئازاو ژیر بوو هاوکات ئەدیب بوو، سوڵتان سەلاحەددینی برای بۆ وڵاتی (اليمن)ی ڕەوانە کرد، لە ساڵی (٥٧٩ك/١١٨٣ز) چووە شاری (مكە)، پاشان هـەموو (اليمن)ی کۆنترۆڵ کـرد. (الخزرجي: العقود اللؤلؤية، ج١/ ل٢٩" أبن خلكان: س.پ، ج١/ ل٢٣٧" المقريزي: السلوك، ج١/ ل١٦٨" الزركلي: س.پ، ج٣/ ل٢٧٧).

٢٤ البنداري: سنا البرق الشامي، ج١/ ل١٨٠" سبط ابن الجوزي: س.پ، ج٨/ ل٣٢٨" أبن خلدون: تاريخ أبن خلدون، ج٥/ ل٢٥٥.

ئەوەی بە (عز الدین جوردیک)ی فەرمانڕەوای ڕاگەیاند کە بۆ ئەوە هاتووە وڵات لە دەستی خاچ دروشمەکان بپارێزێ، فەرمانڕەوای (حماە) باوەڕی بە قسەکانی هێنا و (حماە)ی بەدەستەوە دا[٢٦]، پاشان (جوردیک) ئامادەیی دەربڕی ببێت بە نێردراوی سەلاحەددین و بچێت بۆ لای (سعد الدین کمشتکین) خاوەنی (حلب)، بەڵام هەوڵەکانیان ئەنجامی نەبوو، ئەوە بوو (جوردیک) لەگەڵ (شمس الدین أبن دایە)[٢٧] لەلایەن (کمشتکین) خرانە بەندیخانەوە[٢٨]، هەروەها (کمشتکین) لەم سنوورە نەوەستا، بەڵکو لەگەڵ (سیف الدین غازی) میری موسڵ نامەی گۆڕیەوە و داوای لێکرد هێزەکانی موسڵ بچنە پاڵ هێزەکانی (حلب)[٢٩]، هەروەها حاکمی شاری (طرابلس)[٣٠]ی بۆلای میری خاچ دروشمەکان (الکونت ریموندی سێیەم)[٣١] نارد بەڵێنی پارەیەکی زۆری پێدا ئەگەر هاتوو بتوانێ سەلاحەددین لە (حلب)

---

٢٥ حماە: بریتییە لە ناوچەیەکی شاخاوی دەڕوانێتە سەر شاری (حماە)و ڕووباری (عاصی) و پێکهاتووە لە دوو قەڵای بەرامبەر. (ناصر خسرو: س.پ، ل٤٦" یاقوت الحموي: س.پ، مج٢/ ل١٨٠-١٨١).

٢٦ ابن خلدون: تاریخ أبن خلدون، ج٥/ ل٢٥٥" ابن العماد: س.پ، ج٢/ ل٢٣٦.

٢٧ شمس الدین ابن دایە: لەسەردەمی (نور الدین محمود) والی شاری (حلب) بوو، هاوکات یەکێك بوو لە گەورە میرەکانی، پاش کۆچی دوایی (نور الدین محمود)، لەگەڵ (کمشتکین) ڕێککەوت بۆ پێشڕەوی کردن بۆ شاری دیمەشق و هێنانی (الملك الصالح اسماعیل)، بەڵام هەوڵەکەیان ئەنجامی نەبوو کە لەلایەن (أبن المقدم) شکستی پێهێنرا. (أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل٦).

٢٨ أبن خلدون: تاریخ ابن خلدون، ج٥/ ل٢٥٥.

٢٩ ابن واصل: س.پ، ج٢/ ل٣١" أبو الفداء: س.پ، ج٢/ ل١٣٦-١٣٧" النویري: س.پ، ج٢٨/ ل٣٧٦.

٣٠ طرابلس: شارێکە لە وڵاتی شام ، ئاوی دەریا لە سێ لاوە دەوری دابوو، و یەکێکە لە پێگەکانی وڵاتی شام. (الحمیری: الروض المعطار ، ج٢/ ل٣٩٠ ).

٣١ الکونت ریموندی سێیەم: لە ساڵی (٥٣٥ك/١١٤٠ز) لەدایك بووە، لە ساڵی (٥٥٩ك/١١٦٤ز) بەدیلی گیرا لای (نور الدین محمود)، لە ساڵی (٥٦٩ك/١١٧٤ز) ئازاد کرا، لەوکاتەوە ببووە (چاودێر- وصی) لەسەر پادشا (بلدوینی چوارەم)، لەپاش شەڕی (حطین) کۆچی دوایی کرد. (أبن الآثیر: الکامل، مج٧/ ل٣١٩-٣٢٠" أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل٢٤" عاشور: الحرکة الصلیبیة، ج٢/ ل٧٤٤).

دووربخاتـەوە[٣٢]، (سـعد الـدين كمـشتكين) بـەو پەيوەنديـە نەوەسـتا، بـەڵكو پەيوەندي بە (راشد الـدين بـن سـنان)ی[٣٣] رابـەری (ئيسماعيليەكان) كـرد لـە وڵاتـی شـام، و پـەيمانی پارەيـەكی زۆری دايـە، بـەو مەرجـەی بتوانـێ سەڵاحەددين بكوژێت[٣٤]، (راشد)ی ئيسماعيلی وەڵامـی داواكاريەكـەی (سـعد الـدين كمـشتكين)ی دايـەوە، بـەڵام هەوڵەكـەی سـەركەوتوو نـەبوو، بـەڵكو سەڵاحەددين دەست بەجێ توانی كۆمەڵێك لە (ئيسماعيليەكان) بكوژێت[٣٥]، بـەڵام هەڵوێستی سەڵاحەددين لـە ئاسـت جموجۆڵی سـەربازەكانی موسڵ و حەلەب كە دژ بەو بوون، ئەوە بـوو بە هـەموو شێوازێكی تـاكتيكی دەروونـی كـاری بـۆ رێگـرتن لـە بـەرپا بـوونی جـەنگ لەنێوانيانـدا دەكـرد[٣٦]، هـەموو رێگەيەكی ئاشتيخوازانەی ئەگرتە بەر بۆ گەيشتن بە مۆركردنی رێككەوتنێك لەنێوانياندا كە جێبەجێ كردنـی يەكێتييـەكی سياسـی بـەهێز زامـن بكات و لەرێگەيـەوە بتوانێـت دژ بـەخاچ دروشمـەكان بوەسـتێت، لەهـەمان كاتـدا بتوانێت هێڵەكانی گەرانەوە دابين بكات و لەپشتەوە رێگە لە دوژمن بگرێت

---

٣٢ البنداري: س.پ، ج١/ ل١٨٢" ابن كثير: س.پ، ج١٢/ ل٣٨٤.

٣٣ راشـد الـدين بـن سـنان: خـەڵكی گونـدی (عقر)ەی نزيـك شاری (بـصری) لـە كـاتی سـەردانی بـۆ قـەڵای (المـوت) لەلايـەن خـاوەن قەڵاكـەوە رەوانـەی وڵاتـی شـام كـرا بـۆ رابەرايـەتی كردنـی (ئيسماعيليەكان) لـەو ناوچەيە دوای ئـەوەی هەستی بـە لێهـاتوويی و تونـايی هـزری كـرد، هـەروەها هەنـدێ رووبەرووبوونـەوەی هەبوو لەگەڵ (نور الدين محمود)، ساڵی (٥٨٩ك/١١٩٣ز) كۆچی دوايـی كـرد. (سـبط أبـن الجوزي: س.پ، ج٨/ ل٤١٩" ابن تغري بردي: س.پ، ج٦/ ل١١٧" ايفانوف: دائرة المعارف الاسلامية، ج٩/ ل٤٦٩" بەڵام ابن جبير باسی دەكات و دەڵێ: "مرۆڤێكی شەيتانە". رحلة أبن جبير، ل٢٢٥.

٣٤ العمـري: مـسالك الابـصار، ج٢٧، ورقـة ٦٥" الحنبلـي: شـفاء القلـوب، ل٨٦" ا.ر.جـب: صـلاح الـدين الايوبی، ل١٢٤" بروكلمان: تاريخ الشعوب الاسلامية، ل٣٥٤.

٣٥ ئەمە يەكەم پرۆسەی تيرۆر كردنی سوڵتان سەڵاحەددين بوو لەلايەن ئيسماعيليەكان كەچەند جارێكی تريش هەوڵی بێ ئاكامی تيرۆريان دەدا، (أبن الآثير: الكامل، مج٧/ ل٢٥٣" سبط أبـن الجـوزي: س.پ، ج٨/ ل٣٢٨" أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل٢٤).

٣٦ ابن تغري بردي: س.پ، ج٦/ ل٦٩" ايليسيف: س.پ، ل٤٤٩، سعداوي: التاريخ الحربي، ل٦٣.

و گەمارۆیان بدات،[37] لەهەموو بارێکدا سولْتان سەلاحەددین لە شەڕی موسلْمانان دەترسا، لەبەر ئەوەی خوێنی موسلْمانەکان یەك خوێنە، ڕێگەی تاکتیکی دەروونی بەکارهێنا بۆ ئەوەی هەلْچوونی موسلْمانەکان دابمرکێنێتەوە و لەنێوانیاندا خوێن نەڕێژێ[38]، بۆ ئەوەی لە دوا ڕۆژ سوودیان لێ وەرگرێت و خوێنیان بە فیڕۆ نەچێت، هەرچەندە هەوڵەکانی سەری نەگرت و بە بەرپا بوونی جەنگ لە گردۆلکەی (حماە) لەنێوانیاندا کۆتایی هات و لەڕۆژی (یەك شەممە ١٩ی ڕەمەزانی سالْی ٥٧٠ك/ ١٣ی نیسانی سالْی ١١٧٥ز) سەلاحەددین بەسەرکەوتنێکی یەکجارەکی بەسەریاندا زالْ بوو[39]. و پاش شکست هێنانی بەلایەنگرانی (نور الدین محمود) هیچ دلْ ڕەقانە ڕەفتاری لەگەلْ نەکردن وەکو لەو ئایەتەدا هاتووە: {وَلا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ}[40]،ئەوە بوو شێوازێکی دەروونی تاکتیکی نوێی بەکارهێنا، ئەویش (بەدوای هەلْهاتووان نەکەوت، ئازاری بریندارەکانی نەدا، هاوکات دیلەکانی ئازاد کرد)[41]، هەتاوەکو گوتویانە لەو شەڕانەدا (٧) حەوت کەس زیاتر نەکوژراوە[42]، لەبەر ئەوەی سەلاحەددین مەبەستی بوو متمانەو ڕێزی ئەو موسلْمانانەی کە شەڕی لەگەلْ دەکردن مسۆگەر بکات، دەیویست بەلای خۆیدا رایانکێشێت لەچوارچێوەی ئامانجە تەکتیکیەکانی لەگەلْ خاچ

---

٣٧ العريني: الشرق الادنى في العصور الوسطى (الايوبيون)، ل٥٩.

٣٨ العسلي: صلاح الدين الايوبي، ل١٨١.

٣٩ ابن شداد: س.پ، ل٥٧" البنداري: س.پ، ج١/ ل٨٦" أبن خلدون: تاريخ أبن خلدون، ج٥/ ل٧٥" ابن تغري بردي: س.پ، ج٦/ ل٢٣.

٤٠ واتە (چاکەو خراپە هەمەبەر نین، تۆ هەمیشە وەرامی چاکتر بدەوە، ئەوسا کەسێك لەگەلْ تۆدا دوژمنە، دەبێتە دۆستی نزیکت). (سورەتی فوسیلەت، ئایەتی ٣٤، وەرگێڕانی مامۆستا هەژار).

٤١ أبن كثير: س.پ، ج١٢/ ل٣٨٤.

٤٢ المقريزي: السلوك، ج١/ ل١٦٨.

دروشمەکانـــدا وەك یارمەتیـــدەرێك بـــەکاریان بهێنێـــت[٤٣]، پـــاش ئـــەوە سەلاحەددین بەرەو (حلب) پێشڕەوی کرد بۆ ئەوەی ئابلۆقەی بخاتە سەر[٤٤]، لەچوارچێوەی جەنگـە دەروونیـە تاکتیکییـەکانی تـوانی ئامـانجی خـۆی لـە تەپانـدنی ورەی دوژمـن بـەدیبهێنێت، هـەروەها تـوانی ڕیزەکانیـان پـەرش‌و بڵاو بکات بەشێوەیەك کە بێزاری‌و نائومێدی‌و ترسان لەدەست پێکردنەوەی شەڕی خستە دڵ‌و دەروونی خەڵکی ناوچەکە، بەوپێیـەی شـەڕ دەبێتـە هـۆی مردن‌و ماڵوێرانی‌و هەژاری‌و نەبوونی[٤٥]، پاش ئەوە (حلب)یەکان نامەیان بۆ نـارد و داوای ڕێککـەوتنیان لەگەڵـدا دەکـرد[٤٦]، سـەلاحەددین بـە گرتنـەخۆی (حلب) زۆر دڵخۆش بوو، چونکە دەسکەوتێکی تاکتیکییـەو سەرکەوتنێکی سیاسـییە، هاوکـات متمانـەی موسـڵمانان بـە سـەرکردەی نـوێ زیـاتر بـوو، بەشـێوەیەك شـاعیران‌و وتاربێـژەکان گـەلێك قـسەو هـۆنراوەی بـەنرخیان بەسـەردا هـەڵگوت، تێـدا باسـیان لـە کـردەوەو چـاکەو ئازایەتی‌یـە بـێ وێنەکانیان دەکرد بەهۆی ئەم سەرکەوتنەو ئەنجامە تاکتیکییەکەی لەسـەر ڕێـڕەوی ڕووداوەکـان لەناوچەی شام‌و جەزیرە بەدەستی هێنا، بۆ نموونە قازی دیمەشق (محی الدین بن زکی)[٤٧] هۆنراوەیەکی لـە ستایـشی سـوڵتاندا گوت:

وفتحكم حلبا بالسيف في صفر

---

٤٣ ابن شداد: س.پ، ل٤٢-٤٣" نوري: س.پ، ل١٩٥-١٩٦.

٤٤ أبن العبري: س.پ، ل٣٧٦" حسن: تاريخ الاسلام، ج٤/ ل١٠٥" العسلي: فن الحرب الاسلامي، مج٤/ ل١١٣.

٤٥ أبو شامة: الروضتين، ج١/ ل٢٥٩" الخطاب: الاسلام والنصر، ل٢٠.

٤٦ ابن واصل: س.پ، ج٢/ ل١٠٠" النويري: س.پ، ج٢٨/ ل٣٧٧.

٤٧ قاضی محی الدین بن زکي:لە ساڵی (٤٤٣ك/١٠٥١ ن) لەدایك بووە، باپیری (ابن عساكر) بوو، زاناو ئیمامێکی بەتواناو لێهاتوو بوو، لە شاری دیمەشق کۆچی دوایی کرد. (ابن العماد: س.پ، ج٤/ ل١٠٥" ابن تغري بردي: س.پ، ج٥/ ل٢٦٦).

مبشر بفتوح القدس في رجب[٤٨]

بۆیە دەتوانین بڵێین دەستبەسەرداگرتنی حەلەب لەلایەن ئەیوبییەکان کارەساتێکی گەورە بوو بۆ خاچ دروشمەکانو شکستێکی دەروونیو سەربازی بوو بۆ هێزەکانیان، چونکە بۆ ئەیوبییەکان پەیوەندییە ستراتیژیی و تاکتیکیو سەربازییەکانی نێوان شامو مصری پتەوتر کرد[٤٩]، بەمەش سەلاحەددین توانی بە پشتیوانی جەماوەری موسڵمانان یەکێتیەکی بەهێز بنیاد بنێت نەك بەپشت بەستن بەسەرکردە سیاسیەکان لەنێو میرەکانی ناوچەکەدا[٥٠].

ئامانجی جەنگی دەروونی تەکتیکی جەخت کردنە سەر مەترسی شەڕو بڵاوکردنەوەی ئەوەی کە ڕاکردنو خۆ بەدەستەوەدان ئاسایش بۆ خەڵكو سەربازەکانیش مسۆگەر دەکات، و ئاسانکردنی داگیرکردنی شارەکان لە ڕێگەی بانگەشە کردنو خۆبەدەستەوەدانیان یان ناردنی نوێنەر بۆ لایان[٥١].

ئەو سەرکەوتنانەی سەلاحەددین لە حمص و گردۆلکەی (حماە) بەسەر نەیارەکانی بەدەستی هێنا ترسی خستە دڵو دەروونی خاچ دروشمەکان و لەتواناو هێزی سەلاحەددین بە ئاگا هاتن، ئەویش وای لێکردن بەناچاری ڕێگەی ئاشتی بگرنە بەر لە (مرج صفر)[٥٢] سەرەتای ساڵی (٥٧١ك/١١٧٥ز)

---

٤٨ سبط ابن الجوزي: س.پ، ج٨/ ل٣٧٧" أبوشامة: الروضتين، ج٢/ ل٤٧" ابن كثير: س.پ، ج١٢/ ل٤١٤" البدليسي: س.پ، ل١٥١. (واتە: ڕزگارکردنی حەلەب بە شمشێر لە مانگی صەفەر، مزگێنیە بە ڕزگارکردنی قودس لە مانگی ڕەجەبدا).

٤٩ أبن الأثير: الكامل، مج٧/ ل٢٦١. "عاشور: الحركة الصليبية، ج٢/ ل٧٨٠" Stevenson:the Crusades in the East, P.230.

٥٠ أبن الأثير: الكامل، مج٧/ ل٢٦١. "حسن: س.پ، ج٤/ ل١٠٦" العسلي: صلاح الدين الايوبي، ل١٤٢.

٥١ الدباغ: المرجع في الحرب النفسية، ل٤٩.

٥٢ مرج صفر: دەکەوێتە دەوروبەری شاری دمشق لە بەشی باشووری ڕۆژئاوای. (ياقوت الحموى : معجم البلدان، مج٤ / ل٢٤٤).

**کاتێـك نوێنـەری خـاچ دروشمـەکان دەگاتـە لای سـوڵتان داوای بەسـتنی ڕێککەوتنامەی نێوان هەردوو لای لێ دەکات، سوڵتان دوای ئەوەی مەرجیان لەسەر دادەنێت بەداواکەیان ڕازی دەبێت[٥٣]، چونکە خاچ دروشمەکان لەو ساڵەدا تووشـی نەهامەتیـەکی گـەورە هـاتبوون، هاوکـات ناوچـەی شـام ڕووبەڕووی قەیرانێکی خراپ هاتبوو[٥٤]، ڕەنگە خاچ دروشمەکان لە هێزی سەلاحەددین ترسابن کە هەڕەشەی لێیان دەکرد، ئەمە لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە سەلاحەددین لەپشت ئەم ڕێککەوتنەوە ئامانجی خۆی هەبوو بۆ ئەوەی سەربازەکانی پشوویەك بدەن، بەتایبەتی دوای ڕێککەوتنیان لەگەڵ (حەلەب)یەکان، چونکە ناوچەی شام تووشی ئەو قەیرانە هاتبوو کە پێشتر باسمان لێوە کرد[٥٥].**

**گـرنگترین ڕووداو لەشـەڕدا ڕوخانـدنی ورەی دوژمنـە بـێ شـەڕ کـردن و کۆنترۆڵ کردنیەتی[٥٦]، لەو شێوازە تەکتیکیە دەروونییەی کە سەلاحەددین پیادەی دەکرد بەمەبەستی لاواز کردنی ورەی خاچ دروشمەکان، لە ساڵی (٥٧٥ك/١١٧٩ز)، سـوڵتان فـەرمانی دا بـە سـەربازەکانی کـە ڕەزی (صـفد) لـە دەشـتی (ئـوردن) ناوچـەی (بیـت الاحـزان)[٥٧] بـبڕن، هاوکـات فـەرمانی بڕینـی**

---

٥٣ ابن واصل: س.پ، ج٢/ ل٣٥.

٥٤ چونکە بە هۆی کەمی باران بارینەوە ئەو ساڵە ناوچەی شام ڕوبەڕووی وشکە ساڵی بوو بوویەوە ، (ابن كثير: س.پ، ج١٢/ ل٣٨٦" نوري: سياسة صلاح الدين، ل١٧٤.) ئەمەش خۆی لە خۆیدا هۆیەك بوو کە ناوچەکە توشی قات و قڕی هات کە کاریگەریەکی دەرونی خراپی هەبوو لەسەر دانیشتوانی ناوچەکە بە گشتی و خاچ دروشمەکان بەتایبەتی.

٥٥ ابن الأثير: الكامل، مج٧/ ل٢٧٧" أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل٣٦" ابن كثير: س.پ، ج١٢/ ل٣٨٦.

٥٦ تزو: فن الحرب، ترجمة- فاخر عبد الرزاق، الثقافة الاجنبية، عدد ١، ١٩٨٧، ل٢٢٠.

٥٧ بيت الاحزان: شارۆچکەیەکە لە نێوان دمشق و کەناری دەریادا، خاچ دروشمەکان ئەو ناوەیان لێنا، چوونکە دەڵێن ئەمە شوێنی یعقوب بوو لەوکاتەی یوسفی لێ وون بوو، خاچ دروشمەکان قەڵایەکی بەهێزیان تێدا دروستکرد.(سبط ابن الجوزي: س.پ، ج٨/ل٣٥٤" ياقوت الحموي: س.پ، مج١/ل٤٠٨).

درەختەکانیــشی دابــوو[٥٨]، ئامــانجی ســەلاحەددین لەپــشت ئــەم پرۆســە تاکتیکییــەوە ڕوخانــدنی وورەی دوژمــن و لاوازکردنــی بــوو لــە ڕووی ئابوورییــەوە، بەشێوەیەك سەربازە خاچ دروشمەکان سوود لە چنینەوەی بەرهەمی میوەجات و درەختەکانی و دانەوێڵەکان وەرنەگرن[٥٩]، و ببێتە هۆی پەکخستنی وورەو هێزی دەروونی و شەڕکردنیان[٦٠].

بێگومـان سـوڵتان سـەلاحەددین لـە ئاڕاسـتە کردنـی جـەنگی دەروونـی تـاکتیکی بەردەوام بـوو، کاتێك لەسـەرەتای ساڵی (٥٧٨ك/١١٨٢ز) بـەرەو قـەلای (الکـرك) بەڕێکـەوت، دوای چـەند ڕۆژێـك گەیـشتە ئـەو جێگایـە، و تێبینـی ئـەوەی کـرد کـە خـەڵکێکی زۆر لـەخاچ دروشمەکان کۆبوونەتـەوە[٦١]، (أبن شاهنشاه) دەڵێ: "لەنزیکیانەوە دابەزین، گەمارۆماندان تاوەکو بـەرەو قەلاکەیان هەڵهاتن، دەستمان بەسەریاندا گـرت، هەموو کشتوکاڵەکانیانمان وێران کرد"[٦٢].

لەڕاسـتیدا ئـەو هۆکارانـەی کـە یارمـەتی ئامانجـەکانی جـەنگی دەروونـی تـاکتیکی دەدات شکستەیەك لـەدوای یەکـەکانی دوژمـن و نـەیارەکان و ئـەو زیانە گەورانـەی کـە پێیـان دەکـەوێت و هەڵوێستی لەرزۆکی دوژمن و کەمی بژێوی و بوونی سەرکردایەتی نەگونجاو و کارامـە و دەنگوباسـە خراپـەکانی بـەرەی ناوخۆی دوژمن و بەشداریکردنی دوژمن لەشـەڕێکی درێـژ خایـەن و بـوونی سـوپایەکی بـێ مەشـق و بڵاوبونـەوەی تـرس و بـێ بـاوەڕی لـەنێوان

---

٥٨ أبوشامة: الروضتين، ج٢/ ل٨.

٥٩ ابن واصل: س.پ، ج٢/ ل٨٠" المقريزي: السلوك، ج١/ ل١٨٠.

٦٠ حسين: س.پ، ل٢٠٨.

٦١ ابو شـامة: الروضـتين، ج٢، ل١١" ابـن خلـدون: تـاريخ ابـن خلـدون، ج٥/ ل٣٠٠" شـاكر: س.پ، ج٦/ ل٣٨٩.

٦٢ مضمار الحقائق، ل٩٣.

دانیشتوانی شارەکەیە[٦٣]. بۆنموونە پاش پشوویەك لەلایەن سوڵتان و سەربازەکانیەوە لە دەرەوەی حرانەوە، لەڕێگەی (دیاربەکر)ەوە لە (١٧ی ذی الحجة ساڵی ٥٧٩ك/١١٨٣ز) بۆ ئامەد[٦٤] دەرچوو، پاش گەیشتنیان بۆ ماوەی چەند ڕۆژێ گەمارۆی دان، لە ڕاستیدا شوێنێکی زۆر سەخت بوو، زۆر جاریش سەختی قەڵاکانی بە نموونە دەهێنرایەوە، بەڵام خراپی مامەڵەکردنی والی شارەکە، بووە پاڵنەرێك بۆ ئەوەی خەڵکەکە لە شەڕدا بێ هێزو کەمتەرخەم بن[٦٥]، بەم شێوەیە سەلاحەددین ناکۆکی ناو شارەکەی قۆستەوە و پەنای بردە بەر شێوازێك لە شێوازەکانی جەنگی دەروونی تاکتیکی فەرمانی دا بڵاوکراوە بنووسن و تیایدا هەڕەشە لە خەڵکی شارەکە بکرێت کەبەردەوام بوونیان لەسەر شەڕکردن دەبێتە هۆی ڕیشە کێش کردنیان، بە پێچەوانەشەوە ئەگەر شارەکە بدەنە دەست ئەوا مامەڵەیەکی باشیان لەگەڵدا دەکرێت و بەپێی پێویست باج و سەرانە دەخاتە سەریان، سوڵتان فەرمانی دەرکرد کە بڵاوکراوەکان بەنووکی تیرەکانەوە بکرێن و بۆ ناوشاری (ئامەد)ی بهاوێژن تاکو بیخوێننەوە[٦٦]، لەم کاتەدا سەربازە ئەیوبییەکان توانیان درزێك بخەنە نێو قەڵای شارەکە و خەڵکی ناو قەڵاکە بەناچاری خۆیان بدەن بەدەستەوە و شارەکەیان خستە ژێردەستی سوڵتان سەلاحەددین، ئەم کارەش ئەو قەڵا نزیکانەی تری ئامەدی ناچار کرد کەخۆ

---

٦٣ عبدالله: س.پ، ل١٧.

٦٤ (ئامەد): شارێکی بەناوبانگە دەکەوێتە ڕۆژئاوای دیجلەو شارۆچکەی دیاربەکرەوە، هەورەها مەزنترین و بەناوبانگترین شارەکانی بوو. (یاقوت الحموي: س.پ، مج١/ ل٥٦).

٦٥ ابن الآثیر: الکامل، مج٧/ ل٢٩٩" ابن تغري بردي: س.پ، ج٦/ ل٨٦" ابن العبري: س.پ، ل٣٨١.

٦٦ ابن الآثیر: الکامل، مج٧/ ل٢٩٩" أبوشامة: الروضتین، ج٢/ ل٣٩" أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل١٣٥" أبن کثیر: س.پ، ج١٢/ ل٤٢٣.

بەدەستەوە بدەن، بەتایبەتی ئەو قەڵایانەی کەسەر بە (ئەراتقەکان)[٦٧] بوون، میری شارەکانی تر نوێنەرانی خۆیان بۆ لای سوڵتان سەلاحەددین ڕەوانە کرد و داوای لێخۆشبوونیان لێ دەکرد، پێشتر سوڵتان سەلاحەددین خۆی ئاشتی خستبووە بەردەم ئەوانە و داوای لێکردبوون کە بۆ جیهاد کردن دژ بەخاچ دروشمەکان بێنە ژێر ئالاکەیەوە[٦٨]، بۆ نمونە لە کاتی گەمارۆدانی (شەنگار)[٦٩]دا ساڵی (٥٧٨ك/١١٨٢ز)دا (العماد الكاتب) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: "هەموو ڕۆژێك گوێ بیستی نامەی تیراوەکان دەبیین"[٧٠].

ئەو جەنگە تەکتیکییەی کە لە کاتی شەڕدا ئاراستەی دوژمن دەکرێت دەبێ بە چەکێکی یاریدەدەر بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی کردە سەربازیەکان لە سەردەمی شەڕدا ئەویش لە ڕێگەی ڕووخاندنی دەروونی دوژمن و زاڵبوون بەسەر بیریدا بەشێوازێك کە وا لەپیاوانی دوژمن بکات واز لە پلانیبەرەنگاربوونەوە بهێنن و ورەیان بڕوخێنێت. بۆ نمونە سوڵتان سەلاحەددین خۆی وانیشان دەدا بۆ ئەوە هاتوونە شارە بەهێزو شوورادارەکان تا لە نزیکیدا بژیت وەك (ماردین[٧١]، میافارقین[٧٢]، ئامەد، تل

---

٦٧ ئەراتقەکان: دەگەڕێنەوە سەر (ارتق بن اكسك) کە بە (ظهير الدين) ناسراوە سەر بەهۆزی (دقر- Dager) ی تورکمانیین، کە ئەوانیش دەگەڕێنەوە سەر هۆزی (الغز) کە چوونە نێو ڕیزەکانی (سەلاجیقە) و چەند شوێنێکی تایبەتیان بۆ دیاری کرد بۆ دەسەلاتی خود موختاری (ئۆتۆنۆمی) لەچوارچێوەی سنووری دەوڵەتی سەلجوقی، (ئەراتیقەکان) لە نێو ساڵانی (٤٦٥-٥٢١ك/ ١٠٧٢-١١٢٧ز) لەناوچەی دیاربەکر فەرمانڕەوا بوون، گرنگترین قەڵاکانیان (ماردین و حصن كيف و ئامەد) بوو. (خليل: الامارات الارتقية في الجزيرة والشام، ل ٥٧-٥٨).

٦٨ ابو شامة: الروضتين، ج٢/ ل٤٢.

٦٩ شەنگار: یەکێکە لە شارەکانی جەزیرە، دەکەوێتە ڕۆژئاوای موصل، نزیك چیای شەنگار.( ياقوت الحموی: س.پ، مج٣/ل٧٨).

٧٠ البرق الشامي، ج٥/ ل٤٨.

٧١ ماردین: قەڵایەکە لەسەر لوتکەی چیای جەزیرە، دەڕوانێتەر سەر (نصيبين). (ياقوت الحموي: معجم البلدان، مج٤/ ل١٩٤)، هەروەها ابن بطوطة باسی دەکات و دەڵێت: "چاکترین و خۆشترین شارەکانی ئیسلامە. (تحفة الانظار في غرائب الامصار وعجائب الاقطار، ل١٥٩).

خالد،[73] عين تاب[74] و حلب)، پاشان هەڵدەستا بە سازدانی هەڵمەتێکی تەکتیکی دەروونی، ئەویش ئەوەیە کە سوورە لەسەر مانەوە لە تەنیشتیدا لەباتی گەمارۆدانی بەبێ ئەوەی ڕاستەوخۆ پەلاماری بدات، ئەم شێوازەش ئەوانەی لەناو قەڵاو شارەکە دایە ناچار دەکرد کە داوای دڵنیا بوون بکەن یان هەوڵ بدەن بگەنە جۆرێك لە سازش کردن و ڕێکەوتن بۆ دوورخستنەوەی هێزە گەورەکەی سەلاحەددین لە شارەکەیاندا[75]، چونکە بەگەمارۆدانی شارەکە ناوچەکەیان تووشی زیانێکی گەورە دەبێت. هەر بەهەمان شێواز لەکاتی گەمارۆدانی شاری (موسڵ)دا بۆ جاری سێیەم لەساڵی (٥٨١ك/١١٨٦ز) ڕوویدا[76]، بەرەو شاری (خلاط)[77] دەرچوو، بەڵام نەیتوانی دەستی بەسەردا بگرێت ، پاشان بەرەو شاری (میافارقین) دەرچوو گەمارۆی دا، فەرماندەی بەرگری شارەکە (أسدالدين يرنقش)[78] بوو، کە کەسێکی بەتواناو زیرەك بوو توانی شارەکە بپارێزێت و سەلاحەددین دوور بخاتەوە دوای ئەوەی سەلاحەددین دەستی لە بەکارهێنانی توندوتیژی و هێز هەڵگرت و پەنای بردە بەر بەکارهێنانی شێوازێك لە شێوازە تەکتیکیە

---

٧٢ میافارقین: دەکەوێتە باکوری ڕۆژهەڵاتی دیاربەکر. (یاقوت الحموی: س.پ، مج٤/ل٣٤٩).

٧٣ تل خالد: قەڵایەکە لە دەوروبەری شاری حلب.( یاقوت الحموی: س.پ، مج١/ ل٤٥٢).

٧٤ عین تاب: قەڵایەکی بەهێزبوو، دەکەوێتە نێوان شاری حلب و انطاكية. (یاقوت الحموی: س.پ، مج٣/ ل٣٦٩).

٧٥ أبن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٢٢٩-٣٠١" أبو شامه: الروضتين، ج٢/ ل٤٢" النويري: س.پ، ج٢٨/ ل٣٨٦.

٧٦ أبن العبري: س.پ، ل٣٨٢.

٧٧ خلاط: شارۆچکەیەکی ئاوەدان بوو لە ئەرمینیای ناوەڕاست، ناوبانگی هەبوو لە زۆری ئاو و میوەجات.( یاقوت الحموی: س.پ، مج٢/ل٢٤١).

٧٨ اسدالدین یرنقش: ناوی (مجاهد الدين يرنقش ابن طمان بن غازي)، خاوەنی (شەنگار و خابور و الرقه)بوو، و بووبە ئەتابەکی دەوڵەتی (ابن عمادالدين) بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانی ، لەساڵی (٥٩٤ك/١١٩٧ز) کۆچی دوایی کرد.(العماد الكاتب: الفتح القسي، ل٣١٦" ابو الفداء: س.پ،ج٣/ ل١٩٣).

دەروونیەکانی جەنگی دەروونی، بە پەیوەندی کردن بە (خاتوون) خانی خێزانی خاوەنی (میافارقین) و ئەوەی پێ ڕاگەیاند کە (أسدالدین یرنقش) پەیوەندی پێوە کردووە بۆ بەدەستەوەدانی شارەکە، بەڵام ئێمە مافی ئێوە لەم کارە دەپارێزین، هاوکات (میافارقین) لە ژێر دەسەڵاتتان دەبێت و کچەکانت بۆ کوڕەکانم دەخوازم، لەهەمان کاتدا پەیوەندی بە (أسد الدین یرنقش) کردووە و پێیّ ڕاگەیاندوە کە (خاتون) خان بڕیاری خۆبەدەستەوەدانی بۆ سوڵتان ڕاگەیاندووە، بەمەش سەلاحەددین ئامانجەکانی خۆی لەم کارە پێکا کەخۆی لەخۆیدا جەنگی تەکتیکی دەروونی بوو[79].

بەم جۆرە هێزی (ئەراتقە) کە هێزێکی سەربەخۆ بوو لەناوچوو و هاتە ژێر ئالای سەلاحەددین و لەجەنگەکانیدا دژی خاچ دروشمەکان هاوکاری ئەیوبییەکان بوو[80]، هەروەها ئەیوبییەکان لێدانی (الکوسات)[81] یان لەچوارچێوەی جەنگە دەروونیە تاکتیکیەکانیاندا بۆ گواستنەوەی ئەو نامە خێرایانەی کە لەنێو یەکەکانی سوپادا -بەتایبەتی- لەکاتی شەڕو گەمارۆداندا کە پێشتر لەسەر ئەو جۆرە شێوازە ڕێك دەکەوتن بەکاردەهێنا، بۆ نموونە ئەو شێوازەیان لەکاتی گەمارۆدانی شاری (عکا)دا خستە کار، (العماد الکاتب) لەم بارەیەوە دەڵێت: "نیشانەی نێوان ئێمەو یارانمان لە شاری (عکا) لەکاتی هێرش بردنە سەر دوژمن، لێدانی (الکوس) بوو، هەر

79 أبن الاثیر: الکامل، مج7/ ل312" المقریزی: السلوك، ج1/ ل202" ابن خلدون: تاریخ ابن خلدون، ج5/ ل302" سعداوي: التاریخ الحربي ، ل163.

80 ایلیسیف: س.پ، ل462.

81 الکوسات: بریتیەیە لە دوو سەرقاپ لە مس دروست کراوە هەریەك بەوەی تر دەدرێ بە ئاوازێکی تایبەت دەنگ دەردەکات. (القلقشندي: صبح الاعشی، ج4/ ل8).. هەروەها تەپڵی لەگەڵ بوو. شەوانە دووجار لەناو قەڵاوە لێدەدرا، لێدەری ئەم جۆرە پێی دەوترا (الکوس). (ابن شاهنشاه: س.پ، ل19).

بەبیستنی (کوسەکان) هێرشمان لەسەر خاچ دروشمەکان تازە دەکردەوە"[82].

لەشێوازەکانی جەنگی دەروونی تەکتیکی بۆ جێبەجێکردنی ئامانجەکانی دەوڵەت، کە دەبێت دەزگا ناحکومی وحکومیەکان لەم کردارەدا بەشداربن لەرێگەی پەیوەندی کردنی راستەوخۆو سیخوڕیی یان لەرێگەی پڕوپاگەندە بەچەندین شێوازو هۆکار، لەبەر ئەوەی جەنگی دەروونی ستراتیژی کەبۆ ئاسۆیەکی دوور کار دەکات ئاوا مەزەنەو ئەنجامەکەشی درێژ خایەن و کاتێکی زۆریشی دەوێ[83].

بۆ نمونە یەکەم کارێک کەسەلاحەددین بۆ شەڕی خاچ دروشمەکان ئەنجامیدا پێویستی بەماوەیەکی زۆر بوو (لەبەر ئەوەی خاچ دروشمەکان نزیکەی سەدەیەك لەرۆژهەلاتدا مابوونەوە). ئەوەبوو لەڕووی سیاسیەوە سیستمێکی وردی بۆ خزمەتکردنی ئامانجەکانی دەوڵەت دانا، بەشێوەیەك هەمیشەو بەبەردەوامی دوژمنی لەژێر چاودێریدا هێشتەوە[84]، ئەم سیستەمە لە سایەی بەردەوام کۆکردنەوەی زانیاری پێك هاتبوو، لەرێگەی دامەزراندنی تۆڕێکی بەهێز کەپۆلە سوارچاکێك بەئەسپی گورج و گۆڵ ئەنجامیان دەدا، بۆ نمونە لەساڵی (٥٧٣ك/١١٧٧ز) لەکاتی شەڕی (الرملە)[85] لەباشووری فەلەستین کەبەشکستی سوپای ئەیوبی کۆتایی هات[86]، رووداوەکان ئەوەیان سەلماند سەلاحەددین پۆستێکی چالاکی

---

٨٢ الفتح القسي، ل٤٤٨" بۆ زیاتر زانیاری بروانە: أبوشامة: الروضتين، ج٢/ ل١٨٤" أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل٣٥٠" أبن الفرات: س.پ، م٤ ج٢/ ل٥.

٨٣ نصر: س.پ، ج١/ ل١٠٥.

٨٤ ئەمین: الأستخبارات الأيوبية في عهد صلاح الدين، ل١٣٨.

٨٥ (الرملە): شارێکی گەورەو مەزن بوو، دەکەوێتە باشوری رۆژهەلاتی (یافا) بەدووری (٢٢کم). (ناصر خسرو: س.پ، ل٥٤" یاقوت الحموی: س.پ، مج٢/ ل٤٢١).

٨٦ ابن الأثير: الكامل ، مج٧/ ل٢٦٩.

هەبوو لەكۆنترۆڵ كردنی ئەو پڕوپاگەندەیەی لەولاتی مصر كە لەبارەی كوشتنی (سەلاحەددین)ەوە بلاوببووەوە.

هاوكات خێرایی ئەم پۆستە توانی دەست بەسەر ئارەزووی ئەو كەسانەدا بگرێت كە خۆیان لەدژی فەرمانڕەوایی دەوڵەتی ئەیوبی لەمصر ئامادەكردبوو[87]، هەروەها لەساڵی (٥٧٨ك/١١٨٢ز) سوڵتان سەلاحەددین لەقاهیرەوە بەرێگای (سیناء)دا بەرەو شام كەوتەڕێ، هەر بەگەیشتنی سەلاحەددین، بۆ (أیلە)[88] پۆستەچیەكان هەواڵی كۆبوونەوەی خاچ دورشمەكانیان پێ گەیاند كەلە خۆئامادەكردندان بۆ بڕینی رێگای سەلاحەددین لە بەرەو شام چوونیدا، [89] سوڵتان ئەم هەلەی قۆستەوە بەناردنی هەواڵ بۆ ( عزالدین فرخشاه)[90]ی برازای لەدیمەشق، كە توانی دەستبەسەر (دبوریە)[91] و دێهاتەكانی دەوروبەریدا بگرێت[92]، مێژوونوسی ئەیوبی (محمد بن تقی الدین عمر) كە لەگەڵ كەژاوەی سوڵتان دا بووە، دەڵێ: "ئێمە بەرێگاوە بووین، پۆستەچیەكان (تەتەرەكان) مزگێنی

---

[87] العماد الكاتب: البرق الشامی، ج٣/ ل٤٢" أبو شامة: الروضتین، ج٢/ ل٢٧٢" رنسیمان: س.پ، ج٢/ ل٦٧٣، حسین: س.پ، ل١٧٥، ئەمین: ألأستخبارات الأیوبیة، ل٢٩٤.

٨٨ (أیلە): شارێكە دەكەوێتە سەركەناری دەریای (القلزم)، لەكۆتایی الحجازو سەرەتای الشام، بەندەری ایلەی ئێستا لەكەنداوی عەقبە. (یاقوت الحموی: س.پ، مج١/ ل٢٣٢).

٨٩ أبن الاثیر: الكامل ، مج٧/ ل٢٩٠.

٩٠ (عزالدین فرخشاه)-(بن شاهنشاه بن أیوب)، لەپاش كۆچی دوای باوكی ساڵی (٥٧٨ك/١١٨٢ز) سوڵتان سەلاحەدین (بعلبك)ی پێ دا، وماوەی (٥٠) ساڵ تێیدا مایەوە تاوەكو (الملك ألأشرف موسی بن الملك العادل) گەمارۆیداو دەری كرد بەهاوكاری كوڕی مامی (أسدالدین شیركو) خاوەنی حمص، لەشام نیشتەجێ بوو، تاوەكو بەدەستی هەندێ لەمەمالیك كوژرا، نوسەرو شاعیرێكی زمان پاراو بوو، ودیوانی شیعری گەورەی هەیە. (ابن تغری بردی: س.پ، ج٦/ ل٢٧٦.

٩١ (دبوریة): شارۆچكەیەكە لەنزیك (طبریة) لە قەڵەمڕەوی هەرێمی ئوردن دا. (یاقوت الحموی: س.پ، مج٢/ ل٢٨٧)

٩٢ أبوشامة: الروضتین، ج٢/ ل٢٢٨، المقریزی: السلوك، ج١/ ل٧٧.

سەرکەوتنی مامم (عزالدین فرخشاه)یان لەهەڵمەتی (دبوریە) دا بۆ هێنا"، [93]
هەروەها جگە لەپۆستی زەوی (وشکانی) ئەیوبییەکان سوودیان لە (کۆتری نامەبەر- الحمام الزاجل) [94]، (پۆستی ئاسمان)یشی وەردەگرت، بۆنموونە ساڵی (٥٦٨ك/١١٧٣ز) کاتێك (السودان و النوبیین) لەسەر سنووری باشووری مصر بەمەبەستی هێرش کردنە سەر هەندێ شوێنی ئەیوبییەکان کۆببونەوە، سەرکردایەتی ئەیوبی بەهەواڵی ئەم (کۆبونەوەیان)ی زانی، لەرێگای کۆتری نامەبەرەوە فەرمانی بەبەشێك لەسوپاکەی دا کەهێرش ببەنە سەریان و (کنز الدولە)ی [95] والی (أسوان) لەدەستیان رزگار بکەن [96]، هەروەها بەرێگای کۆتری نامەبەرەوە هەواڵی هاتنی هەڵمەتی (صقلیە) بۆ سەر ئەسکەندەریەیان گەیاندە سوڵتان سەلاحەددین لەو کاتەی کەلە (فاقوس)دا [97] دابەزیوو، [98] هاوکات (ابن ابي طي) دەڵێت: "هۆی خۆ

---

٩٣ مضمار الحقائق ، ل٩٣-٩٤.

٩٤ الحمام الزاجل: دەتوانین بە پۆستی ئاسمانی ناوی بنێین لە دەوڵەتی ئەیوبی، لەبەر ئەوە دەوڵەتان لەسەر ئەم جۆرە پۆستە ڕاهاتبوون پێش دەرکەوتنی دەزگا پەیوەندیيە نوێیەکان بە تایبەتی لە کاتی شەڕەکاندا بەهۆی تیژی بیری‌و خێرایی فرینی و گەڕانەوەی بۆ شوێنی خۆی ئەگەر چەند ساڵێك لەو شوێنەوە دووربێت. (أبو شامة: الروضتين، ج١/ ل٥٢١" ئەمین: الاستخبارات الايوبية، ل٣٠٠).

٩٥ (كنز الدوله): نازناوێکە بۆ یەکەم جار لەلایەن خەلیفەی فاطفی(الحاكم بأمر الله) بەخشرا بەحاکمی (النوبه) کە (أبو المكارم هبه الله)، ودوا کەسیش کەئەم نازناوەی هەڵگرت لەسەردەمی سوڵتان سەلاحەدین بوو، (كنز الدوله) لەو سەردەمەدا والی شاری أسوان بوو، کەهەوڵی پیلانی سەربازانی سودانی هەڵهاتوو لەناوچەی صعیدی مصری لەدژی سوڵتان پێ ڕاگەیاند، بەم هەواڵە سوڵتان ناچار بوو لەناردنی سوپا و توانی وولاتی النوبەو باکووری سودان رزگار بکات. أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل١٦ پەراوێز (٢)).

٩٦ سعداوی: التأريخ الحربى ، ل٣١-٣٣.

٩٧ (فاقوس): ناوی شارێکە لە رۆژهەڵاتی مصر لە کۆتایی ئەم ولاتە لە بەشی شام. (ابن حوقل:صورة الارض،ل١٣٦).

٩٨ ابن الآثير: الكامل ، مج٧/ ل٢٤٩-٢٥٠" البنداري: س.پ، ج١/ ل١٧٢" ابوشامة: الروضتين، ج١/ ل٢٣٥" ابن واصل: س.پ، ج٢/ ل٨٤.

بەدەستەوە دانی (بعلبك)[99] لەساڵی (٥٧٠ك/١١٧٥ز) دا، ئەوەیە (یمن)[100]ی والیان کاتێك زۆری ژمارەی ئەیوبی بینی، لەکارەکانیدا شڵەژا، بەکۆتری نامەبەردا هەواڵی بۆ حەلەب نارد، بەلام هیچ هەواڵێکی بۆ نەگەڕایەوە، ئەمیش بەناچاری داوای ئەمانی کردو (بعلبك)ی دا بەدەست سوڵتان سەلاحەددینەوە"[101].

دوا بەدوای یەکبوونی بەرەی ئیسلامی بۆ رووبەڕووبونەوەی خاچ دروشمەکان، سەرکردایەتی ئەیوبی زۆر گرنگی بەبارودۆخی سیاسی وڵاتی شام دەدا بەتایبەتی دوای مردنی (نور الدین محمود)، وپۆستەی (ووشکانی و ئاسمانی) لەچوار چێوەی ئامانجە دەروونییە تەکتیکیەکانی سەلاحەددیندا بوون بۆ ئاگادار بوون لە هەموو وردەکاریەکانی جیهانی ئیسلامی تاوەکو بەئاسانی بارودۆخی دەوڵەتەکەی کۆنتڕۆڵ بکات.

سوڵتان سەلاحەددین پەنای دەبردە بەر شێوازە تاکتیکیە دەروونییەکان دەسمەبەست هاوپەیمانی لەگەڵ هەندێ لەمیرەکان لە دژی ئەوانی تر دەبەست، وەکو هۆکارێکی پاڵنەر لەخۆبەدەستەوەدان، بۆ نمونە بەهاوپەیمانی لەگەڵ (ریموند) میری (طرابلس)، دژی خاچ دروشمەکان ئەو شێوازەی پیادە کرد،[102] بۆیە (ریموند) پەنای بردە لای سوڵتان

---

٩٩ (بعلبك): شارێکی کۆنە لەخاکی شام، لەسەر شاخ دروست کراوە بەبەرد، کۆشکی زۆرو سەرنج راکێشی تێدابوون. (یاقوت الحموی: س.پ، مج١/ ل٣٥٨).

١٠٠ (یمن): لەسەردەمی پاشا( نور الدین محمود زنگی)والی بوو، لەسەر شاری (بعلبك) تاوەکو گەمارۆدانی سەلاحەدین بۆ بعلبك و دەست بەسەراگرتنی لە (٤)ی رەمەزانی ساڵی (٥٧٠ك/١١٧٥ز). (ابن الأثیر: الكامل ، مج٧/ ل٢٥٤).

١٠١ ابن الأثیر: الكامل ، مج٧/ ل٢٥٤" ابو شامة: الروضتین، ج١/ ل٢٤٧.

١٠٢ (العماد الكاتب) دەیگێڕێتەوە کاتێك خاچ دروشمەکان بۆ شەڕی (حطین) لە دژی سەلاحەددینی ئەیوبی کۆبوونەوە لە ئەنجامی ئەو خۆئامادە کردنە دەروونیو مەعنەوی و سەربازییەوە کە لەلایەن سەلاحەددین (ریموند) کرا. (ریموند) میری (طرابلس) چیرۆکێکی هەیە کاتێك لای پادشا (نورالدین محمود) دیل بوو لەکاتی ڕوودانی شەڕی (حارم) ساڵی (٥٥٩ك/١١٦٤ز) و لەدیلی مایەوە تا ساڵی

سەلاحەددین و داوای لێکرد ببێتە هاوپەیمانی لە دژی پادشای قودس (جای لوزجنان) و سوڵتان بەمە ڕازی بوو، بێگومان سوڵتان ئامانجێکی تاکتیکی دەروونی لەو هاوپەیمانەدا هەبوو و بۆ پتەوکردنی ئەو هاوپەیمانییە هەموو دیلەکانی هاوڕێی ئازاد کردو پەیمانی هاوکاری بەهەموو شێوەیەك پێدا، هاوکات پێی ووت دەتکەمە پادشا بەسەر هەموو (فەرەنجەکان)ەوە، لەوکاتەوە (ریموند) سەر بە سەلاحەددین بوو، لە ئامۆژگارییەکانی بۆ موسڵمانان ڕستگۆ بوو، بەشێوەیەك خاچ دروشمەکان لێی ترسان موسڵمان بووبێت، ئەمە جگە لەوەی کە کۆمەڵێك لەخاچ دروشمەکان لەگەڵیدا بوون[103].

(ریموند) بە (جای لوزجنان)ی وت: "سەلاحەددین بەهیچ یەکێك لە سوڵتانەکان بەراورد ناکرێت لەڕووی دەسەڵاتو پلان دانان و توانای لە ڕووبەڕووبوونەوەی مەترسیەکاندا، ئەگەر جارێك شکان مانای کۆتایی نییە، بەڵکو هێمنو لەسەرخۆ و لە شوێنێك نیشتەجێ مەبن، باشتر وایە تێکەڵی نەبین و هەروەها بە سادەیش تێی نەڕوانین و بەپێچەوانەش نەبێت و لەهەمان کاتدا مەرجەکانیشی قبوڵ بکەین"[104]. بەڵام میر (أرناط)[105] میری

---

(٥٧٠ك/١١٧٤ز) واتە پێش مردنی (نورالدین محمود) کە ئازادی کرد بەرامبەر بە (١٥٠) هەزار دینار و ئازاد کردنی (١٠٠٠) هەزار دیلی موسڵمانان، کاتێك پادشای (قودس) کۆچی دوایی کرد کوڕێکی بچوکی ناتەواوی لەشوێنی خۆی بەجێ هێشت، و ئەم ببووە وەصی لەسەری تاکو ئەمیش کۆچی دوایی کرد، میراتی مەملەکەت بۆ دایکی بەجێ ما، کە مێردی کرد بەسوارچاکێك کە لە ئەورووپاوە هاتبوو بەناوی (جای لوزجنان)و لەسەر تەختی مەملەکەت دانیشت، لەوکاتەدا پادشای نوێ داوای حسابی لە (ریموند) کرد لەماوەی (چاودێری –وەصایە) لە ساڵی (٥٨٢ك/١١٨٦ز)، (الفتح القسي، ل٦٨. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: ابن واصل: س.پ، ج٢/ ل٤٢" نوری: سیاسة صلاح الدین، ل٢٥٥-٢٥٦).

١٠٣ العماد الکاتب: الفتح القسي، ل٦٧-٦٨" أبن الآثیر: الکامل، مج٧/ ل٣١٩" أبوشامة: الروضتین، ج١/ ل٢٤٠، ج٢/ ل٧٤" ابن کثیر: س.پ، ج١٢/ ل٣٨٩.

١٠٤ العماد الکاتب: الفتح القسي، ل٦٦.

قەڵای (الكرك) بە توندی وەڵامی (ریمۆند)و هاوڕێكانی دایەوەو پێی وتن: "سەبارەت بە ترس لە موسڵمانان زۆرت تێپەڕاند، گومان لەوەدا نییە كە ئەوانت دەوێت و حەزت پێیانە، دەنا قسەی واسادەت نەدەكرد، ئەوەش كە دەیڵێی گوایە زۆرن، ئاگر زیان بەداری زۆر ناگەیەنێت"[106]. (أرناط) بۆ خۆی لەپێشكەوتن بۆ شەڕی موسڵمانان لە (طبرية)[107] هاندەریان بوو، دوای ئەوەی كەس بەڕاستی گوێی لە (ریمۆند) نەدەگرت لەبەجێ هێشتنی جێگای خۆیان كە ئاوی لێ بوو[108]، چونكە بڕوایان وابوو كە ڕێككەوتنی لەگەڵ سەلاحەددین مۆر كردووە، بۆیە داوایان لە پادشا كرد كە فەرمانی جوڵان بدات، لەسەر فەرمانی ئەو بەرەو (طبرية) بەڕێكەوتن و (صفوريه)[109] یان هەڵبژارد وەك ناوەندی جموجۆڵیان[110]، چونكە ئاوی بۆخۆیان و لەوەڕگەی بۆ ئاژەڵەكانیان لێ بوو[111]. لێرەدا دەتوانین بڵێین سوڵتان سەلاحەددین سوودی لە ناكۆكی و كێشە ناوخۆییەكانی خاچ دروشمەكان وەرگرت، و ئەم هەلەی قۆستەوە و كردی بە بنەمایەك بۆ دانانی پیلانێكی

---

١٠٥ ارناط: ناوی رینۆدی شایتۆن لە سەرچاوە ئیسلامیەكان بە ارناط ناسراوە، میری انگاكیا بوو كاتێك بەدیلی لای موسولمانان گیرا، ماوەیەك بە دیلی مایەوە ، لە سالی ٥٧٣ك/١١٧٧ز ئازادكرا، (اتینیت دی میلی) خواست كە لە میراتی باوكی هەرێمی ئوردن و هەردوو قەلای الكرك و الشوبك مایەوە.
(Schiun: Renoud de chathatillong,pp148-149)

١٠٦ ابن الآثیر: الكامل، مج٧/ ل٣٢٤" حسین: س.پ، ل٤٢٠.

١٠٧ طبرية:دەكەوێتە سەرچیا لە هەرێمی فلسطین، هەروەها دەڕوانێتە سەر دەریاچەی گبریە. (یاقوت الحموی: س.پ، مج٣/ل٢٤٨).

١٠٨ ابن الآثیر: الكامل، مج٧/ ل٣٢٤" العسلي: صلاح الدین الایوبی، ل١٨٥.

١٠٩ صفوریە: كورەو شارۆچكەیەك بوو لە دەوروبەری هەرێمی ئوردون لە ولاتی شام نزیك طبرية. (یاقوت الحموي: س.پ، مج٣/ ل١٩٥).

١١٠ العماد الكاتب: الفتح القسي، ل٦٦" أبن الآثیر: الكامل، مج٧/ ل٣٢٤" أبن شداد: س.پ، ل٨٥" أبوشامة: الروضتین، ج٢/ ل٧٦" النویري: س.پ، ج٢٨/ ل٣٩٩.

١١١ رنسیمان: س.پ، ج٢/ ل٧٣٦" العریني: الشرق الادنى في العصور الوسطى (الایوبیون)، ل٨٦"
.Stevenson: The Crusades in the East, P.244

تاكتيكى دەروونى، كاتێك ئامادەيى خۆىو سوور بوونى بۆ شەڕى خاچ دروشمەكان پيشاندا، بەم رەفتارەى پادشاى (بيت المقدس)ى ناچار كرد پەنابەرێتە لاى (ريمۆند)و داواى ڕێككەوتنى لێبكات و (ريموند) بەناچارى وەلامى دايەوە، چونكە هاوڕێكانى پێيان ڕاگەياند: "ئەگەر پشتگيرى نەكەيت، ئێمە ئايين ريسوا ناكەين"[112]، بەمەش سەلاحەددين لە جێبەجێ كردنى ئامانجە تەكتيكيەكەيدا سەركەوتوو بوو، بەڕوخاندنى ورەى دوژمنو تێكدانى ريزەكانيان، بەشێوەيەك توانای شەڕكردنى سەربازانى سەلاحەددينيان نەبێت، جگە لەوەى هەستان بە ژەهراويكردنو تێكدانى بيرو كانياوەكانيان تا سوودى لێ وەرنەگرن،[113] بێ ئاوىو تينوێتى كاريگەرترين چەكى دەروونى بوو كە سەربازانى سەلاحەددين زۆر بە وريايىو ژيرانە لە دژى خاچ دروشمەكان بەكاريان دەهێنا.

بێگومان بێبەش كردنى دوژمن لەپێداويستييە سەرەكييەكانى ژيان، لە بڕينى ئاو لە خەڵكى شەڕكەرو سوتاندنى و دابەستنى مەنجەنيق بۆيان چەندين شێوازى دەروونى بوون كە سەلاحەددين لە دژى ئەوان بۆ شكست پێ هێنانيان بەكارى دەهێنا.

ئەمە لە شەڕى (حطين)دا ڕوويدا لە كاتێكدا لە بەرەبەيانى ڕۆژى هەينى (٢٤ى رەبيع الاخر سالى ٥٨٣ك/١١٨٧ز) سوپاى خاچ دروشمەكان لە (صفوريه)وە بەرەو سەربازگەكانى موسلمانان لە (حطين) پێشڕەويان كرد بۆخۆى سەلاحەددين ئەم كارەى دەويست، كات هاوينێكى زۆر گەرم بوو[114]، تاكتيكى سايكۆلۆژىو مەعنەوى لەكاروبارى جەنگيدا لاى سەلاحەددين لەكاتێكدا دەردەكەوێت كە كاروبارە جەنگيەكان بەخەيالى هيچ

---

١١٢ العماد الكاتب: الفتح القسي، ل٦٨.

١١٣ ابن الآثير: الكامل، مج٧/ ل٣٢٥.

١١٤ العماد الكاتب: الفتح القسي، ل٧٩" غنيم: س.پ، ل٣٦.

سەرکردەیەکدا تێپەڕ نەدەهات، ئەو کاتەی دەستی بەسەر چاڵە ئاوەکانی ئەو ناوچەدا گرت، و خاچ دروشمەکانی لێ بێبەش کرد، لە کاتێکدا ئەوان لەکاتی پێشڕەوی کردنیان لە سەربازگەکەیان لە (صفوریە) دەستیان کرد بە تێکدانی ئاوی بیرەکان[115]، ئەوکاتە خاچ دروشمەکان نزیک سەربازگەکانی موسڵمانەکان بوونەوە لە (حطین) تینوێتی هیچی پێ نەهێشتبوون[116]، بەو شێوەیە تا ڕۆژی دواتر کە ڕۆژی شەممە بوو مانەوە، بەڵام سەربازەکانی سەلاحەددین چاوی تەماحیان خستبووە سەریان کە پێشتر ئەیان ترساندن[117]، ورەیان بەرز بوو بەدرێژایی شەو هەندێك لە سەربازەکانی دەستیان کردبووە هاندانی یەکتر و سەلاحەددین بەناویاندا دەگەڕا، بەپێی ئەو پیلانە جەنگیە کە داڕێژرابوو شوێنی سەرکردەو فەرماندەکانی دیاری کرد، دەستی بەهاندانی سەربازەکان کرد و خۆیو ئەوانەی ئامۆژگاریان پێشکەش دەکرد دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی گیانی تێکۆشان و قوربانی دانو شەهید بوون لە پێناوی خوداو سەرکەوتندا.[118]

لەگەڵ ئامادە باشی هەردوو لایاندا لە (حطین)ی نزیك دەریاچەی (طبرية) شەڕی کۆتایی بەرپا بوو، لە ئەنجامی ئەو تەکتیکە دەروونیوسەربازییانەی سەلاحەددین پەیڕەوی کرد، خاچ دروشمەکان بە ورەیەکی ڕوخاوەوە چونە مەیدانی شەڕەکەوە[119]، لەبارێکی دەروونی ترسناکدا پاش ئەوەی لە ناوەڕاستی هاوینێکی سوتێنەردا دەشتایەکیانیان بڕیبوو لە توێنێتیدا هەسکەیان دەهات، لەوکاتەدا سەلاحەددین هەڵکردنی بایەکی بەهەل زانی

---

١١٥ ابن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٣٢٥.

١١٦ العسلي: فن الحرب الاسلامي، مج٤/ ل١٤٠.

١١٧ العماد الكاتب: الفتح القسي،ل٧٩-٨٠" ايليسيف: س.پ، ل٤٦٥.

١١٨ ابن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٣٢٥" ابن شداد: س.پ.ل٨٦-٨٧"العسلي: صلاح الدين الايوبى، ل١٦١.

١١٩ ابو الفداء: س.پ، ج٢/ ل١٥٥" ابن تغري بردي: س.پ، ج٦/ ل٢٩.

کەبەرەو سەربازگەی خاچ دروشمەکان دەچوو فەرمانی دەرکرد چ گژوگیای دەشتەکان هەیە بیسوتێنن[120]، ئەنجامدانی ئەو کارە بەیەکێك لە هۆکارەکانی سەرکەوتن دادەنرێ، ئەو بایە دوکەڵێکی زۆری لەگەڵ خۆی هەڵگرتبوو بۆ نێو ئوردووی خاچ دروشمەکان کە باری زۆر گران کردبوون و بەو شێوەیە نا ئومێدانە دژ بە تێنوێتی و دوکەڵ و چەك دەجەنگان، بۆیە لە کۆتاییدا بەو پەڕی بێهێزیەوە ڕایانکرد[121]، بەم جۆرە سەلاحەددین مەبەستەکانی بەکارهێنانی جەنگی دەروونی تاکتیکی لەم شەڕەدا دژ بە خاچ دروشمەکان پراکتیزە کرد، جەنگی (حطین) چاکترین نموونەیە بۆ بەکارهێنانی لایەنی دەروونیی بۆ داماڵینی ورەی جەنگ کردن لای دوژمن، ئەو مانۆڕەی سەلاحەددین نمایشی کرد پلانێکی کت و پڕ بوو بۆ شلەژاندنی خاچ دروشمەکان لەو شەڕەدا کە بووە هۆی شپرزە بوون و لەت بوونی بڕوایان لەبەرەنگار بوونەوەیان یان سەرکەوتن، ئەمەش بووە هۆی نەمانی ورە بۆ جەنگ کردن، کە بە جەنگی دەروونی تاکتیکی ناودەبرێت[122].

لەشێوازە دەروونیە تاکتیکیەکانی سەلاحەددین ئەوە بوو، ئاڕاستەی ناوچە کەنارییەکانی شامی کرد، بەتایبەتی دوای شەڕی (حطین)و رزگارکردنی شارو قەلای خاچ دروشمەکان، لە ناوچەکەدا بۆ پێشڕەوی کردنی ڕاستەوخۆ بەرەو قودس سستی نواند، بێگومان سەلاحەددین لەم تەکتیکەیدا ئامانجی هەبوو، ئەویش دابڕینی خاچ دروشمەکان بوو لە بنکە دەریاییەکانی کە پەیوەندی بەجیهانی دەرەوە هەبوو، بەتایبەتی ڕۆژئاوای

---

١٢٠ العماد الكاتب: الفتح القسي، ل٧٩" أبن شداد: س.پ، ل٨٨" أبو شامة: الروضتين، ج٢/ ل٧٦" النويري: س.پ، ج٢٨/ ل٤٠٠.

١٢١ ابن الآثير: الكامل، مج٧/ ل٣٢٥" أبن شداد: س.پ، ل٨٨" سبط ابن الجوزي: س.پ، ج٨/ ل٣٩٣" أبن العديم: س.پ، ج٣/ ل٩٤" ابوشامة: الروضتين، ج٢/ ل٧٧" أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل١٩٠" ابن كثير: س.پ، ج١٢/ ل٣٢١.

١٢٢ زكار: س.پ، ل٨٦" المعاضيدي: س.پ، ل١٧١.

ئەورووپی، بەمەش گەمارۆدرابوون لەناو وڵاتی شام[١٢٣]. ڕەنگە ئەمەش لەچوارچێوەی ئامانجە تەکتیکیەکانی بێت بۆ ئاسان کردنی پەیوەندی دەریاوانی لەنێوان بەندەرەکانی مصرو شامدا[١٢٤]، ئەو سەرکەوتنەی سەلاحەددین لە ئەنجامی لاوازیو کەمی ڕیژەی خاچ دروشمەکان نەبوو، بەڵکو هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەرکەوتوویی نەخشەو پلانە سەربازییەکانی، هەروەها دانایی و لێهاتوویی خۆی و ئەنجوومەنی جەنگی دەوڵەتەکەی و بەشداریکردنی ڕاستەوخۆی لەشەڕەکاندا[١٢٥]، سولتان لە هەلبژاردنی کاتو شوێنی شەڕەکە سەرکەوتوو بوو، کە مانگی تەمموز بوو، بێگومان گەرمترین مانگەکانی ساڵە لەناوچەکەدا، جگە لەکەمی ئاو لە بیرو کانیاوەکان، هەڵسا بەدانانی سەربازەکانی لەسەر، (طبرية) بەمەش سوپای سەلاحەددین کەوتە نێوان خاچ دروشمەکانو سەرچاوە ئاوییەکان[١٢٦]، و فەرمانیدا بەتێکدانی هەموو بیرو کانیاوەکانی ناوچەکە بۆ ئەوەی سوودی لێ وەرنەگرن[١٢٧]، بۆیە دەتوانین بڵێین تینوێتیو گەرمی لە چەکە دەروونیەکان بوو کە سەلاحەددین لە بەرژەوەندی لەشکرەکەی دژی خاچ دروشمەکان بەکاری دەهێنا، هەروەها بوونی خودی خۆی لە ناوەڕاستی گۆڕەپانی شەڕەکە هۆکارێکی دەروونیو مەعنەوی گرنگ بوو، بۆ ورە بەرزیو پاڵنانی سەربازەکانی لە خۆڕاگرتن لەبەرامبەر دوژمندا، چونکە خۆی لەنێو جەرگەی شەڕەکەدا هاواری دەکرد "وا اسلاماه– وای لە ئیسلام"[١٢٨] تێبینی تەواوی هێزەکانی دەکرد لەهەر لایەك لاواز بوونایە لەوێ شەڕی دەکردو هاوکاری

---

١٢٣ عاشور: الحركة الصليبية، ج٢/ ل٨١٣" نوري: سياسة صلاح الدين، ل٢٩٨" نوفل: س.پ، ل١٧٨.

١٢٤ غنيم: س.پ، ل٣٨" Stevenson: the crusades in the east, P.249.

١٢٥ زكار: س.پ، ل٨٦.

١٢٦ ابن شداد: س.پ، ل٨٦.

١٢٧ ابن الآثير: الكامل، مج٧/ ل٣٢٥" العسلي: صلاح الدين الايوبي، ل١٨٥.

١٢٨ ابن شداد: س.پ، ل ٨٧.

سەربازەکانی دەکردو بەدەنگێکی بەرز هاواری دەکردو دەیووت: "شەیتان درۆ دەکات"[129]. ئەمەش ورەو باوەڕ بەخۆ بوونی دەگێڕایەوە دڵو دەروونیانو بەبیری دەهێنانەوە هەڵهاتن تەنیا لە شەیتانەوەیە.

لەئەنجامی ئەو شێوازە تاکتیکیە سەرکەوتووەدا لە دوای شەڕی (حطین)، سەلاحەددین توانی شارەکانی (عکا و صفورية والناصره و قيسارية‌و نابلس والداروم[130] و الرملة وارسوف[131] و يافاو بيروت) هەرهەمووی ڕزگار بکات[132]، کاتێك شاری (صور) بەهۆی شورا بەهێزەکەیەوە ببووە کۆسپ لەپێشیدا ناچار بەجێی هێشت، بەڵام بەردەوام بوو لە ئاراستە کردنی پرۆسەکەی لەناوچەکانی تری وەکو (بيت المقدس) و شارە کەناریو ناوخۆییەکان و توانی (هونين)[133] ڕزگار بکات، هەورەها (جبلة[134] واللاذقية‌و صهيون[135]) و دواتر بەرەو باکوور بەڕێبکەوێت[136] و دەست بەسەر قەڵاکانی (بكاس[137] والشغر[138] وبرزيه[139] و دربساك[140] و بغراش[141]) دابگرێت، [142]کە

---

١٢٩ ابن الآثير: الكامل، مج٧/ ل٣٢٦" أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل١٩١.

١٣٠ الداروم: دێیەکە دەکەوێتە نێوان خان يونس و غزه . (ياقوت: س.پ، مج٢ / ل ٢٧٧) .

١٣١ ارسوف: شارێکە لەسەر دەریای ناوەڕاست نێوان (قيساريه و يافا). (ياقوت: س.پ، مج١/ل١٢٦).

١٣٢ النـويري: س.پ، ج٢٨/ ل٤٢١" گروسـيە: س.پ، ل٧٤" حـسن: س.پ، ج٤/ ل١٠٦" قاسـم: س.پ، ل١٤٤.

١٣٣ هونين: دێیەکە دەکەوێتە بەشی باکوری ناوچەی (الحوله) لەسەر چیاییەك بەناوی خۆی ناسراوە. (ياقوت: س.پ، مج٤/ل٤٩٠).

١٣٤ جبلە: شارێکە دەکەوێتە نێوان (اللاذقية و بانياس)،لە سوريا لە سەر کەناری دەریای ناوەڕاست. (ياقوت: س.پ، مج٢/ل٣٠).

١٣٥ صهيون: قەڵایەکی بەهێزە لە نزيك کەنارەکانی دەریای ناوەڕاست، سەر بە شاری (حمص)ە. (ياقوت: س.پ، مج٣ / ل ٢١٢).

١٣٦ ابن الآثير: الكامل، مج٧/ ل٣٤٠" أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل٢٤٧" الحميدة: الحروب الصليبية، ج٤/ ل١٧.

١٣٧ بكاس: قەڵایەکە لە دەوروبەری شاری حەلەب لەسەر کەناری ڕووباری (العاصی). (ياقوت: س.پ، مج١ /ل٢٧٤).

لەتەنیشت میرنشینی (ئەنتاکیا)ی خاچییەوە بوون، هەروەها بەشێك لە سوپاکەی دووبارە بەرەو باشوور ئاڕاستە کرد و توانی لە کۆتایی ساڵی (٥٨٤ك/١١٨٨ز)دا قەڵای (الکرك)ی بەهێز ڕزگار بکات کە پێی دەوترا (بەردی بیابان)، لە کۆتایی چالاکییە سەربازییەکانیدا و بەهاتنی وەرزی زستانو دوای پشوودانێك، پێش ئەوەی بۆ دیمەشق بگەڕێتەوە (صفدو کوکب)یشی ڕزگار کرد.[١٤٣]

هەروەها لە کاتی ڕزگارکردنی هەردوو قەڵای (برزیەو صور) پلانی شەڕ کردنی بە نۆرە پیادە کرد، سەربازەکانی بەسەر سێ بەشدا دابەش کرد، هەربەشێك ماوەیەکی دیاریکراو شەڕیان دەکرد، داوتر پشوویان دەدا، بەشی دووەمو هەروەها سێیەمیش شەڕیان دەکرد[١٤٤]، بەمەبەستی لاواز کردنی وورەی خاچ دروشمەکان و ئیفلیج کردنی توانا جەنگیەکانیان و گومان کردن لە توانای سەرکردەکانیان و دروست بوونی دۆخێکی دەروونی خراپ کە سەرکردەو فەرماندەکانیان لێهاتوو نەبوون و هاوکات وەکو سەلاحەددین لەبەرکانی جەنگدا پسپۆریش نەبوون.[١٤٥]

---

١٣٨ شغر: قەڵایەکی بەهێزە نزیك (انطاکیا). (یاقوت: س.پ، مج٣/ل١٤٧).

١٣٩ برزیە: قوللەیەکە نزیك دەریای ناوەڕاست، لەسەرچیاییەکی بڵندە. (یاقوت: س.پ، مج١/ل٣٠٤).

١٤٠ دربساك: قوللەیەکی بەهێزە دەکەوێتە باکوری بغراس. (ئەمین: الاستخبارات الایوبیە، پەراوێزی٢١٦، ل٢١٥).

١٤١ بغراش: شارێکە دەکەوێتە لای ڕاستی شاری انطاکیا، لە شاری حەلەب و انگاکیا (٤ فرسخ) دوورە،نزیکەی (٢٤کم)ە.

١٤٢ أبن خلدون: تاریخ أبن خلدون، ج٥/ ل٣١٥" النویري: س.پ، ج٢٨/ ل٤٠٩" الحمیدة: س.پ، ج٤/ ل٣٥.

١٤٣ ابن شداد: س.پ، ل٩٥" النویري: س.پ،ج٢٨/ ل٤١٠-٤١١.

١٤٤ العماد الکاتب: الفتح القسي، ل١١٤" أبن شداد: س.پ، ل١٠٥" أبن العدیم: س.پ، ج٣/ ل١٠٥" ابو شامة: الروضتین، ج٢/ ل١٣١.

١٤٥ حسین: س.پ، ل٢٠١.

جـەنگی دەروونـی تـەکتیکی بەچـەندین شـێوازو ڕێگـای جیـاواز هـەوڵ دەدات بۆ دووبەرەکی نانەوە لەنێوان گەل و سەرکردایەتیان بە پابەند کردنی دوژمـن بـە هەڵـسان بەچـەندین کـار کـە لـەتوانای خۆیـان زیـاتر بێـت[146]، بـۆ نموونـە سـوڵتان سـەلاحەددینی ئـەیوبی نـاکۆکی و دژایـەتی نێـوان تـیرەو تایفەکانی دوژمنی بەهەل زانی و قۆستیەوە بۆ سەرکەوتنی خۆی و خستیە نێـو چوارچێوەی پیلانـەکانی، بێگومـان ئەمـەی بەتێگەیـشتن و زیرەکییـەوە کـرد وەکـو چـۆن لەشـەڕی (دمیـاط)دا لەیـەک کاتـدا بەبەرچـاوی یـەکترەوە پەیوەندی بەتیرەو تایفە جیا جیاکانەوە دەکرد، ئەمە بووە هۆی زیاد کردنی دژایـەتی نێـوان پاشـا (أملـری)[147] و خـاچ دروشمـەکان، هەنـدێکیان گومـانی لـەوەی تـر دەکـرد، ئەمـەش بەسـتنی ڕێککـەوتنی لەگەڵـدا ئاسـان دەکـردو مەرجەکانی سەلاحەدینیش قبوڵ دەکران[148]. هەروەها سوڵتان سـەلاحەددین لـەپاش شـەڕی (حطـین) بەهـەمان شـێوازی تـەکتیکی دەروونـی بـەڕێگای هاوپـەیمانی لەگـەڵ هەنـدێکیان تـوانی خـاڵی بـەهێزو لاوازی سیاسـەتی جەنگی خاچ دروشمـەکان بزانێت، لەوانـە (یوسف بن بابیط) کە لـە هـەموو کاروچالاکییەکانی لەدژی خـاچ دروشمـەکان وەکـو راوێـژکار بـەکاری دەهێنـا[149]، و (الامـیرە سـیبیل) خێزانـی (مـیر بۆهیمنـد سـێیەم) مـیری (انطاکیـا) کـە سـیخوڕی سـوڵتان سـەلاحەددین بـوو بەسـەر میللـەتی خـۆی، بـەهۆی زانیاریەکانیەوە خزمەتێکی چاکی دەگایەندە پلانەکانی سوڵتان، کەئاشکرا کردنـی نهێنیـەکان بـوو، لەپاداشـتی ئـەم کارانـەش سـوڵتان خـەڵات و دیـاری

---

١٤٦ رشتی: الدعاية وأستخدام الراديو في الحرب النفسية، ل٢٥٢.

١٤٧ املـری: اموری یەکـەم، فـەرمانڕەوای (بیت المقدس) بـوو، لـە پـاش مردنـی بلدوینی سێیەم لـە نێو سـالانی (٥٥٧-٥٦٩ك/١١٦٢-١١٧٤ز) ئەمـەش دوا پادشـای بـەهێزی (بیت المقدس)ی خاچ دروشمـەکان بوو. (امین:المشطوب الهکاري، ل١٢٢، پەراوێزی (٥)).

١٤٨ الاهل: صلاح الدين الايوبي، ل١٤٩.

١٤٩ رنسیمان: س.پ، ج٢/ ل٧٥٠.

بەنرخی پێشکەش دەکرد[١٥٠]. لەمەش زیاتر سەلاحەددین پلانی تێکدانی ڕیزەکانی خاچ دروشمەکانی داناو ناکۆکی لەنێوانیان دروستکردو پەیڕەوی دەکرد، هەروەها وەکو هەوڵدانێك بۆ لاواز کردنیان هەوڵیدا سۆزی هەندێك لەسەرکردەکانیان ڕابکێشێ. (أبن شداد) ئاماژەی پێدەکاتو دەڵێ: "سوڵتان جارێکیان لە شەوالی ساڵی (٥٨٧ك/١١٩١ز) دانیشتو خاوەنی (صیدا)ی ئامادە کرد بۆ گوێ گرتن لە پەیامو قسەکانی لەگەڵ گروپێکدا کە لەگەڵی دا ئامادە بوون، مێژوو نووسی ناوبراو ئامادە دەبێت سوڵتان ڕێزێکی زۆری لە مێوانە خاچ دروشمەکانی گرت و قسەو گفتوگۆی لەگەڵ کردن و بەپێی نەریتی باوی ئەو کاتە شتی پێشکەش کردنو کاتێکیش خواردن هەڵگیرا، پاش ئەوە بڕیاردرا کە (المركين) خاوەنی (صور) گوێ ڕایەڵی سوڵتان بێت کە کۆمەڵێك لە گەورە پیاوانی خاچ دروشمەکان هاتبوونە ڕیزیەوە لەوانە خاوەنی (صیدا)، سەلاحەددین مەرجی بۆ (المركين)ی هەڵگەڕاو دانا.. مەرجەکەش ئەوە بوو کە (المركين) دژایەتی خۆی بۆ خاچ دروشمەکان کە لێیان هەڵگەڕاوەتەوە دەربخات"[١٥١]، هۆی ئەمەش ئەو ترسە گەورە بوو لێیان، جگە لەوەی ناکۆکی نێوانیان بە هۆی ژن خوازیەوە بوو، بەپێی قسەی (أبن شداد) مەبەستی سوڵتان لەم مەرجانە دروست کردنی ناکۆکی بوو لەنێوانیاندا.

سوپای سەرکەوتوو ئەو سوپایە نیيە کە زیان بە گیانو چەكو تەقەمەنی دوژمن دەگەیەنێت، بەڵکو ئەو سوپایە سەرکەوتووە کە وەرەی دوژمن دەڕوخێنێ، بۆیە دەگوترێ شەڕ کردن لە بنەڕەتدا تێکۆشانێکی

---

١٥٠ العماد الكاتب: الفتح القسي، ل٢٥١-٢٥٢" أبو شامة الروضتين، ج٢/ ل١٣١" أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل٢٦٧" النقاش: العلاقات الاجتماعية والثقافية والاقتصادية بين العرب والافرنج خلال الحروب الصليبية، ل١٥٢" Grosset: Histoire des Crusades, vol. II. P822.

١٥١ النوادر السلطانية، ل٢٦٣.

مەعنەوییە[١٥٢]. لە ڕاستیدا پەیوەندییەکانی ئەیوبی و ئینگلیزی گومان و دڵە ڕاوکـێی خـستە نێـو ڕیـزی خـاچ دروشمـەکان بەگـشتی و فەرەنـساییەکان بەتایبەتی، سەرسوڕمان لە دەم و چاویاندا بەدی دەکرا، بەشێوەیەك توانـای شیکردنەوەی هۆکارە پاڵنـەرەکانی ئەم پەیوەندییەو زانینـی نهێنییـەکانیان نـەبوو، و پرسـیاریان دەکـرد ئایـا ئینگلیزەکـان لـەژێر پـەردەی ئـەو جـۆرە پەیوەندییە موسڵمانەکان لـە خشتە دەبەن، یان بە ڕاسـتی لەسـەر حـسابی فەڕەنـسیەکان ڕێککـەوتنیان لەگەڵـدا دەکـەن. گومـانی فەڕەنـسیەکان ڕاسـت دەرچـوو بەتایبـەتی لـە کـاتی نەخۆشـی (ڕیـچارد شـێردل)[١٥٣]دا کـە سـوڵتان سـەلاحەددین گرنگییـەکی زۆری پـێ دەدا، هاوکـات سـوپای سـەلاحەددین هێرشی کردە سەر سەربازگەی فەڕەنسیەکان[١٥٤]،و بێگومـان ئـەوەیان لا ڕوون ببـووەوە کـە پەیوەندیـەکی نهێنـی هەیـە لـە پێنـاوی واژۆ کردنـی ڕێککـەوتن

---

١٥٢ بیریە: الذكاء والقيم المعنوية في الحرب، ل١٠١.

١٥٣ ریـچارد شـێردڵ(ریـشارد قلـب الاسـد): ریجـاردی یەکـەمی پادشـای ئینگلتەرایـە لـەنێو سـاڵانی (١١٨٩ز/١١٩٩ز) فـەرمانڕەوا بـوو، لـە سـاڵی (٥٥٢ك/١١٥٧ز) لەشـاری (اكسفورد) لـەدایك بووە، لـە سـێیەم هەڵمەتی خاچ دروشمەکان بەشداری کرد، لە ململانـێ دابوو لەگـەڵ (فلیـب ئوگـستس و بەربەروسـا)، بـەڵام پاپـا (گریگـوری هەشـتەم) تـوانی ئاشـتیان بکاتـەوە، بەتایبـەتی دوای کـەوتنی شـاری (قـدس) بەدەسـتی سوڵتان سـەلاحەددینی ئـەیوبی، (ریجـاردی شـێردڵ) سـەرکردایەتی خـاچ دروشمـەکانی دەکـرد لـەکاتی گـەمارۆدانی شـاری (عکـا)، پاشـان پەیوەنـدی لەگـەڵ سـەلاحەددن پەیـدا کـرد، لەسـاڵی (٥٨٨ك/١١٩٢ز)دا ڕێککەوتنامـەی لەگـەڵ سـەلاحەددین واژۆ کـرد، بـەپێی ئـەو پەیمانـە ناوچـەی سـنووری نێـوان خـاچ دروشمـەکان و ئەیوبیەکان دیاری کرا، ڕیجارد لـەکاتی گەڕانـەوەی بـە دیلـی گـیرا لەلایـەن پادشای نەمسا (لیوبولـد)، بـەڵام کاتێـك گەڕایـەوە ولاتـی خـۆی دووبـارە سـەرکرادایەتی شـەڕێکی کـرد لـە دژی پادشـای فەڕەنسا (فیلیب ئوگستس) ساڵی (٥٩١ك/١١٩٤ز)، لـەژێر شـووراکانی کۆشـکی (شالۆ) لـە فەڕەنـسا کۆچـی دوایی کرد. بێگومان ڕیجارد سەرکردەیەکی ئازاو لێهاتوو بوو بەشـێوەیەك موسڵمانان لێـی دەترسان، بۆ نموونە کاتێك سوارەکان ئەسپەکانیان دەبەستەوە بەدارێك هەڵدەگەڕانەوە، هاواریان دەکردو دەیـان گـووت: "لەچـی دەترسـن؟ دەڵـێی ریجـارد بەدواتانەوەیـە". (بـولارد: بريطانيـا والـشرق الاوسـط، ل٥" العسلي: فن الحرب الاسلامي، مج٤/ ل٥٢٣" هـ.ن: الحرب والحضارة، ل١٥" غنيم: س.پ، ل٥٤-٥٧.

١٥٤سعداوي: الحرب والسلام، ل٣٤.

نامەیەك لە نێوان سەلاحەددینی ئەیوبیو ڕیچاردی شێردڵ، جگە لەوەی سوڵتان سەلاحەددین ڕەفتاری هاوڕێیانەی بە ئەمەکی لەگەڵ ڕیچارد دەکرد، نەك دوژمنایەتی و سەرسەختی کردن، بەلام (أبن شداد) ئەوەی بۆ ئاشکرا کردوین کە سەلاحەددین ئامانجی تایبەتی خۆی هەبوو لەم ئاشتییە، ئەویش ناسینی هێزو تواناو ورەیان بوو [155].

هاوکات (ڕیچاردی شێردڵ)یش ئامانجی خۆی لەم ئاشتییەدا هەبوو، ئەویش زیاتر ئاشنا بوون لە بارودۆخی ناو سەربازگەی موسڵمانان، و تێکچوونی یەکێتی ڕیزەکانیان، بەتایبەتی بێزاریو نا ئومێدی دانیشتوانو ئۆردووی شاری (عکا)و جیاوازی فەرماندەکان لەگەڵ سەلاحەددینی ئەیوبی لە ڕاو بۆچوونەکان کە سەرەتای دەست پێکردنی کێشەکانی سەلاحەددین بوو [156].

هەروەها لەکاتی بوونی لە بەیروت دا یەکێ لە سەربازەکانی بۆ (جبیل) [157] نارد، چونکە خاوەنی لە ڕیزی دیلە خاچ دروشمەکانی شەڕی (حطین) بوو، پاشان لەگەڵ پاشاکەیان بۆ بەندیخانەی شاری دیمەشق بەڕێخران، بەمەرجی ئازادکردنی لەگەڵ والی دیمەشقدا ڕێککەوت لەسەر خۆ بەدەستەوە دانی (جبیل)، سوڵتان سەلاحەددین بەداواکاریەکەی ڕازی بوو، بەوەش دەستی بەسەر شاری (جبیل)دا گرت [158]، پاشان لە شاری (بیروت) بەرەو شاری (عسقلان) کەوتە ڕێ کە ببووە کوسپێك لە ڕێگای مصرو شام، لەوێش لەگەڵ (الملك العادل)ی برایو سەربازانی مصر بەمەبەستی

---

١٥٥ النوادر السلطانية، ل١٥٤.

١٥٦ سعداوي: الحرب والسلام، ل٣٥.

١٥٧ جبيل: شارێکی بەناوبانگە لە کەناری دەریای ناوەراست نزیکەی (٨) فەرسخ بەواتای (٤٨كم) لە سەرووی شاری بەیروتەوە دوورە.(یاقوت: س.پ،مج٢/ ل٣٤).

١٥٨ أبن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٣٣٠" أبن الشداد: س.پ، ل٦٥" ابو الفداء: س.پ، ج٢/ ل١٥٦.

گەمارۆدانی شاری (عسقلان) کۆبۆوە، هاوکات پاشای (بیت المقدس) کە لای موسڵمانان لە شەڕی (حطین)ەوە دیل کرابوو، سوڵتانی بەرامبەر ئازاد کردنی ئاگادار کردەوە، ئامۆژگاری گەمارۆدراوە خاچ دروشمەکان بۆ بەدەستەوەدانی شارەکە دەکات، سوڵتان بەو مەرجە ڕازی بوو، خاچ دروشمەکان گوێڕایە ڵی ئامۆژگاریەکەی بوون، پاش ئەوەی لە هەڵوێستیان دڵنیا بوون و بە ناچاری شارەکەیان بەدەستەوەدا و بەژن و ماڵ و منداڵیانەوە بەرەو (بیت المقدس) ڕۆیشتن، ئەوە بوو سوڵتان لە ٣٠ی جمادی الاخرە ساڵی (٥٨٣ك/١١٨٧ز) دەستی بەسەر شاری (عسقلان)دا گرت، کە خاچ دروشمەکان ماوەی ٣٥ ساڵ داگیریان کردبوو[١٥٩].

سوڵتان پەیمانەکەی خۆی لەگەڵ پاشای (بیت المقدس) لەکاتی گەمارۆی (حصن الاکراد)[١٦٠] بەجێهێنا، لە (أنطرسوس)[١٦١] لەپاش ڕزگارکردنی (قودس)، بەمەرجێك مەملوکی بێت، و بەهیچ شێوەیەك لە دژی موسڵمانان چەك هەڵنەگرێت، ئەویش بەو مەرجانە ڕازی بوو[١٦٢]، بەڵام بە گەیشتنی بۆشاری (صور) پەیمانەکەی بیر چوو وەو لەهەمانکاتدا بەبەستنی پەیمان لەگەڵ (المرکیز) بۆ شەڕ کردن لەگەڵ سەلاحەددین پێشێلی پەیمانەکەی پێشتری کرد، بەڵام ئەوەبوو خاچ دروشمەکان شکستێکی گەورەیان بە خۆیانەوە دی و شاری (قودس) گەڕایەوە ژێردەستی موسڵمانەکان و سەلاحەددین ڕێزێکی باشی لە گەورە مەسیحیەکانی (قودس) گرت، ئەم

---

١٥٩ أبن الاثير: الكامل، مج٧/ ل ٣٣٢" أبن شداد: س.پ، ل٦٥-٨١" ابو الفداء: س.پ، ج٢/ ل١٥٧.

١٦٠ حصن الاكراد: قەڵایەکی بەهێز و پۆڵایینە دەکەوێتە سەر چیا، کە لە بەشی ڕۆژئاواوە ، بەرامبەر شاری (حمص)ەوە ، ئەو چیایەی (الجليل) کە پێوەندی بە لبنانەوە هەیە لە نێوان بعلبك و حمص. (یاقوت: س.پ، مج٢/ ل١٥٢).

١٦١ انطر سوس: شارۆچکەیەکە لە کەنارەکانی دەریای شام ، دەکەوێتە کۆتایی سنوری کارگێڕی شاری دیمشق، (یاقوت: س.پ، مج١/ ل٢١٦).

١٦٢ أبن شداد: س.پ، ل٨١.

کارەی بە مەبەستی تەکتیکی دەروونی و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خەڵکی شارەکانی تر بووە.

جەنگی دەروونیی تەکتیکی لەپێناو بەدەستهێنانی ئامانجی سیاسەتی شەڕەنگێزی، شێوازی تایبەتی خۆی هەیە بەبێ ئەوەی پەنا بۆهیچ کردەیەکی سەربازی ببرێت، لەوەیە بە ڕاگەیاندنی جەنگی دەروونی بووترێ "جەنگی سیاسی" ئەمەش چونکە جۆرێکە لە کێشەی نێوان دەوڵەتان، هەرلایەکیان هەوڵدەدات بۆ چەسپاندنی ئیرادەی خۆی بەسەر لایەنەکانی تردا کە هیچ کاتێك هێزی سەربازی تیادا بەکارناهێنرێت[١٦٣]. بۆ نمونە کاتێك سەلاحەددین لە ڕوخاندنی قەلای (النطرون)[١٦٤] لێبووەوە لە (مرکیس کونراد دی مونتفرات)ەوە نوێنەرێکی پێ گەیشت و داوای بەستنی ڕێککەوتنی لەگەڵدا کردە بەو مەرجەی (بیروت و صیدا)ی پێ بدرێت و (عکا)ش ببێتە بنکەیەك بۆ کارەکانی پاش ئەوەی لە خاچ دروشمەکانی دەبات، هەروەها نوێنەرەکە داوای لە سەلاحەددین کرد لەسەر ئەوە سوێندی بۆ بخوات، سەلاحەددین لەسەر ئەو مەرجانە ڕازی بوو بەو هیوایەی بتوانێ دووبەرەکی لە نێوان خاچ دروشمەکان دروست بکات، بەلام سەلاحەددین ئەو مەرجەی بۆ (مرکیس) دانا کە (عکا) گەمارۆ بدات، سەرەتا لە خاچ دروشمەکانی وەربگرێت، پاش ئەوەش (صورو بیروت)ی پێ ببەخشێت وەکو بنەمایەك بۆ جێبەجێ کردنی ڕێککەوتنەکەی نێوانیان[١٦٥]. (العدل

---

١٦٣ الدباغ: المرجع في الحرب النفسية، ل٥٠.

١٦٤ النطرون: دەکەوێتە باشوری ڕۆژهەلاتی شاری الرملە. (امین: الاستخبارات الایوبیە،ل١١٥،پەراوێزی ١١٦ ).

١٦٥ أبن شداد: س.پ، ل٢٦٣" أبو شامة: الروضتین، ج٢/ ل١٩٣" أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل٣٧٩" نوري: سیاسة صلاح الدین، ٣٤١. نوێنەران بەردەوام دەهاتنە لای سوڵتان سەلاحەددین، هاوکات گفتوگۆ درێژەی پێدرا لەگەڵ (مرکیس) تاوەکو بەدەستی دوو لە ئەندامانی (ئیسماعیلیەکان) تیرۆر کرا.

النجيبي)[١٦٦] نارد بۆ ئاگادار کردنەوەی بۆ ئەوەی سەلاحەددین لە ئەنجامی لە خشتە بردنی (صورو بیروت) نەدۆڕێنێ، سەلاحەددین ئامانجی لەو ڕێککەوتنەوە ئاراستە کردنی جەنگێکی تەکتیکی دەروونی بوو دژ بە (ڕیچارد) کە خۆی ناچاری ڕێککەوتن بێ لەگەڵیدا، هەروەها بوو ئەو ئامانجەی بەدیهێنا[١٦٧]، بەتایبەت کاتێك (ڕیچارد) کردەی نزیك بوونەوەی نێوان (کونرادو سەلاحەددینی) بیست سوور بوو لەسەر تازە کردنەوەی پەیوەندی لەگەڵ (الملك العادل) کە دەیخواست هاوڕێیەتی سەلاحەددین بەدەست بهێنێت و ئەو هەلە لەدەست (کونراد) بدات، بۆیە نامەی لەگەڵ (العادل)ی دیبلۆماسی زیرەکدا گۆڕیەوەو ڕێزی لێنا، پێشنیازێکی بۆ ئاشتی پێشکەش کرد، بەپێی ئەو پێشنیازە (العادل) (جوان-Joan)ی خوشکی (ڕیچارد) بخوازێت[١٦٨]. بەو مەرجەی قودس ببێتە پایتەختی پادشایەتیەکەی، هەموو شارە گرنگەکانی کەناریش وەك (عکا)و (یافا)ی بۆ بگەڕێتەوە لەگەڵ (جوان)ش دا قەشەو ڕاهیبەکان لەوێ نیشتەجێ بن سەرباری ئەوەی کە پێویستە (العادل) سوارەکانی (الداویە[١٦٩] و

---

١٦٦ العدل النجيبي: نوسەری سوڵتان سەلاحەددین بوو، یەکێك بوو لەئەندامانی شاندی گفتوگۆی نێوان سوڵتان و مرکیس کونراد، هەروەها نوێنەری سەلاحەددین بوو لەکاتی وتووێژکردن لەگەڵ أرناط خاوەنی صیدا کە نەگەیشتە هیچ بنەمایەکی سەرەکی. (سعداوي: التاریخ الحربي، ل٢٨٠" Stevenson: op,p279).

١٦٧ أبن شداد: س.پ، ل٢٧٢-٢٧٣" أبو شامة: الروضتين، ج٢/ ل١٩٦" حسین: س.پ، ل٢٤٩.

١٦٨ ئەوەی سەیرەو لەهەمان کاتیشدا پەژارەیە کە (العادل)ی نوێنەرو سازش کار تەنیا بە خێزانە موسڵمانەکانی وازی نەهێنا، ئەو مەسەلە ترسناکە کە بەڕێوە بوو هیچ خەریکی نەدەکرد، بەڵکو (جوان)ی ئەوروپی و مێینەی ئینگلیزی خەیاڵ و هۆشی بوون، ئەمەی بەهەل زانی کە (جوانە خان) بچێتە پاڵ ژنە (کوردو عەرەب و تورکەکان) کەهەی بوون (الآمین: صلاح الدین بین العباسیین والفاطمیین والصلیبین، ل١٢٢).

١٦٩ الداویە: کۆمەڵێك بووە لە سوارەی خاچ دروشمەکان لە ساڵی (٥١٢ك/١١١٨ز) دامەزرابوو پێشیان دەوترا سوارەی پەرستگا، ڕۆڵی گرنگیان هەبوو لە شەڕی خاچ دروشمەکان. (رنسیمان: س.پ،ج٢/ل٢٤٩-٢٥٠).

الاسبتاريه[١٧٠]) بەچەند دێیەك ڕازی بكات[١٧١]. لەسەر هەردووكیان پێویست بوو دیلەكان ئازاد بكەنو سەلاحەددینیش (خاچی خاچان)[١٧٢] بگێڕێتەوە، هاوكات (ڕیچاردشێردڵ)یش بۆ ئینگلتەرا بگەڕێتەوە[١٧٣]. لەهەمان كاتدا ڕیچارد بەهەمان شێوازی تەكتیكی دەروونیو مەعنەوی كاتێك بە ئاشتی وەلامی سەلاحەددینی دایەوە لە ڕێگای ئەوپرۆسەی جێبەجێ كراو، و پیلان بۆ داڕێژراوە بۆ ناكۆكی دروست كردن لە نێوان سەلاحەددینو (الملك العادل)ی برایدا، ئەمە بۆخۆی شێوازێكی زیرەكانە بوو بەمانای وشە كە لەلایەن (ڕیچارد)ەوە پیادە كرا، لەبەر ئەوەی سەلاحەددین ئەگەر هاتو داوای (الملك العادل)ی ڕەت بكردایەتەوە، ئەوا ناكۆكی دەكەوتە نێوانیان ئەو كاتەش (ڕیچارد) ئامانجەكەی لە لاواز كردنی ورەی سوپای ئەیوبی جێبەجێ دەكرد، بەلام ئەگەر ڕازی بوو ئەوا كێشەیەكی تری بۆ دروست دەكات، ئەویش ئەوەیە كە (جوان) مێرد بە موسڵمان ناكات، ئەگەر بێتو نەچێتە سەر ئایینی مەسیحی، بەمەش قودسیان بۆ دەگەڕێتەوە، بەلام

---

١٧٠ الاسبتاريه: گروپێكی ئایینی چەكدار بوون، بەسوارەی (القديس يوحنا) ناسرا بوون، لە سالی (٤٩٢ك/١٠٩٩ن) دامەزراوە، سەرەتا چارەسەری نەخۆشیان دەكرد دواتر بوونە جەنگاوەری خاچ دروشمەكان. (هـ.س:ل٢٤٨-٢٤٩).

١٧١ العماد الكاتب: الفتح القسي، ل٥٥٥" أبن الاثير: الكامل ، مج٧/ ل٣٨٩" العليمي: س.پ، ج١/ ل٣٨١.

١٧٢ خاچی خاچان: بریتی‌یە لەپارچە دارێكی شێوە كۆی لەخۆ گرتووە، خاچ دروشمەكان پێیان وابوو كە (مەسیح)ی لەسەر خاچ دراوە، بۆیە ئەم خاچە زۆر پیرۆز بوو لایان، بطریك لەشاری قودس هێنابووی، لەشەڕەكاندا لەبەرامبەر موسڵمانەكاندا بەرزیان دەكردەوە، چونكە بڕوایان وابوو لەكاتی قەیراندا ڕزگاریان دەكات. (نوري: سياسة صلاح الدين، ل٢٨٨. Rosebauit, Saladin Prince of Chivalay, P.185

١٧٣ نوري: سياسة صلاح الدين، ل٣٤٢. Rosebauit, Saladin Prince of Chivalay, PP.280-281

(الملك العادل) مەسیحیەتی پێ قبوڵ نەبوو، ئەو مەسەلەیە هەروەکو خۆی مایەوە[174].

دوای ئەوەی (ڕیچارد) بە کوشتنی (کونراد) دڵشاد بوو، ئەوەشی بیست کە سەلاحەددین لە ڕۆژهەلاتدا ڕووبەڕووی هەندێ ئالۆزی بۆتەوە، مەرجەکانی ئەو ڕێککەوتنەی پێشتر لەگەڵ (الملك العادل)دا لەسەر ڕازی بوونی پیشان دابوو ڕەت کردەوە، پاش ئەوەی لە جمادی الاخرەی ساڵی (٥٨٥ك/١١٩٢ز)، (الداروم)ی گەمارۆداو دەستی بەسەریدا گرت[175]. بەم جۆرە لەم شەڕو پێکدادانانەدا موسڵمانەکان توانیان زیان لەبەرەکانی دواوەی سەربازگەی خاچ دروشمەکان بگەیەنن، جگە لەوەی هەندێ جار ڕێگەی هاتووچۆیانیان دەبڕی، بەتایبەتی لەکاتی پێشڕەوی کردنی خاچ دروشمەکان بۆ شاری قودس[176]، زۆرجار ئەم چالاکیانە بە شەو ئەنجام دەدران، بەدەگمەن بەبێ دەسکەوت دەگەڕانەوە، چونکە بەجلی ڕەش دزەیان دەکردە نێو ریزی خاچ دروشمەکان و چالاکییەکانیان بەسەرکەوتوویی بەئەنجام دەگەیاند[177].

لەنێو موسڵمانەکاندا چەند پیاوێکی توندوتیژ هەبوون کە دەچوونە نێو چادرەکانی خاچ دروشمەکان بە شمشێرەکانیان لە ملی پیاوەکانیان گیر دەکرد و ناچاریان دەکردن کە ورتەیان لێوە نەیەت و زاتی قسە کردنیان نەمێنێت و بەزیندوویی بیانهێنن، لەگەڵ ئەوەشدا هەرچی سامان و ئەسپ و شتی تریان پێ بوایە لێیان دەسەندن[178]، بۆ نموونە سوڵتان سەلاحەددین لە

١٧٤ العماد الكاتب: الفتح القسي، ل٥٥٦-٥٥٧" أبن شداد: س.پ، ل١٩٥-١٩٦" أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل٣٧١-٣٧٢" نوري: سياسة صلاح الدين، ل٣٤٢-٣٤٣.

١٧٥ ديورانت: قصة الحضارة، م٤ ج٤/ ل٤٢.

١٧٦ عاشور: الحركة الصليبية، ج٢/ ل٨٤٥.

١٧٧ لامب: شعلة الاسلام، ل١٩٢-١٩٣.

١٧٨ النويري: س.پ، ج٢٨/ ل٤٣١.

ساڵی (٥٧٤ك/١١٧٩ز)دا ناردنی بۆ (صیدا و بیروت) بۆ دوورینەوەی بەروبوومی کشتوکاڵی خاچ دروشمەکان خۆیان و وشترەکانیان بە باری گرانەوە بۆ لای سەلاحەددین گەڕانەوە[١٧٩].

لە مانگی (شعبانی ساڵی ٥٨٥ك/١١٩٠ز)دا ئەم تیپە (دزە) لە (بدو)ەکان لە ناوچەی (عکا) هێرشیان کردە سەر خاچ دروشمەکان و هەندێکیان لێکوشتن و ئەوانی تریان دەستگیر کرد و هێنایانە لای سەلاحەددین، و لەکاتی پێشڕەویاندا بەرەو (عسقلان)، ئەندامانی ئەم تیپە توانیان چوار لە سەربازە خاچ دروشمەکان بڕفێنن بەهەمان شێوە هێنایان بۆ سەلاحەددین، پاشان فەرمانی زیندانی کردنیاندان. هەروەها لە (٢٢ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٥٨٧ك/١١٩١ز)دا توانیان بچنە نێو سەربازگەی خاچ دروشمەکان، ئەمجارە دەسکەوتیان تەنیا (ئەسپێك و گوێدرێژێك) بوو[١٨٠]. ئەمە جگە لە پڕۆسەی چالاکی دزی کە پێشتر باسمان لێوە کرد کەخۆی لەخۆیدا کاریگەری دەروونی کتوپڕی هەبووە لەسەر خاچ دروشمەکان، هۆیەکیش بوو بۆ چاندنی دڵە ڕاوکێ و پشێوی لەنێو سەربازگەی خاچ دروشمەکاندا.

بەم شێوەیە سەلاحەددین توانی جەنگێکی دەروونی تاکتیکی دژ بەو خاچ دروشمانەی لەچوارچێوەی ئەو پڕۆسە سەربازییەی ناوچەکەدا ئامادە بوون بەرپا بکات و ببێتە هۆی بەرزکردنەوەی وورەی سەربازەکانی خۆی، لەهەمان کاتدا توانی کار بکات بۆ جێ لەق کردن و تەسك کردنەوەی گیانی وورەی دوژمنان، تاوەکو ناچاریان بکات بڕوخێن و خۆبەدەستەوە بدەن یان شکست بهێنن و هەڵبێن.

---

١٧٩ البنداري: س.پ، ج١/ ل٣٢٤" أبو شامة: الروضتين، ج٢/ ل٨" ا.ر.جب: س.پ، ل١٧٢-١٧٤.

١٨٠ ابن شداد: س.پ، ل١٩٢،١٨٥،١٣٤ .

له نموونەیەکیتردا سولْتان سەلاحەددین (٣٠٠) سێ سەد جەنگاوەری خۆبەخشی بۆ چوونە نێو ئۆردوگای خاچ دروشمەکانەوە بێ ئەوەی هەستیان پێبکەن ڕێکخست و تالانو دزی پارەو ئاژەڵو پیاوو هەندێ جاریش منداڵان دەستی پێدەکرد، بەم جۆرە کەسانەی کە ئەو کارە دەکەن دەوترێ (خۆبەخش یان سەرکێش) سەلاحەددین خۆی ڕێکی دەخستن و فەرمانی پێویستی هێرش بردنو تێکدانی پێ دەدان[181].

سەلاحەددین لە ڕێگای ئەم چالاکیانەوە توانی جەنگی دەروونی تاکتیکی ئاڕاستەی دانیشتوانی مەدەنی ناو سەربازگەی خاچ دروشمەکان بکات بۆ شلەژاندنی بارودۆخیان و ترس خستنە دڵو دەروونیان و ئیفلیجکردنی توانا سەربازیەکانیان.

جگە لەمانە سەلاحەددین شێوازی تری تاکتیکی دەروونی بەکارهێنا، نموونەش لەسەر ئەم حاڵەتە ئەوەیە کە سولْتان سەلاحەددین سەرەڕای پیرۆزی (ڕۆژی هەینی) وەك جەنگێکی دەروونی تەکتیکی ڕۆژانی هەینی بۆ شەڕەکردن هەڵدەبژارد، هەرچەندە ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ڕۆژانی تر شەڕی نەکردبێت، و چاوەڕوانی ڕۆژانی هەینی کردبێت، بەلام بە ئەنجامی شەڕەکانی لەم ڕۆژەدا زۆر گەش بین دەبوو و کاریگەریشی لەسەر دەروونی

---

١٨١ یەکێك لەوانە شەوێك کۆرپەیەکی تەمەن (٣) سێ مانگانەی لەناو سەربازگەی خاچ دروشمەکان دزی بوو، دایکەکەی بەپەرۆشەوە هەر بۆی دەگەڕا، تاکو هەواڵەکەی گەیشتە لای یەکێك لە میری خاچ دروشمەکان، ئەویش ڕێگەی دا کە بچێتە لای سولْتان وە پێی گوت: "سولْتان پیاوێکی میهرەبانە و دڵی پێت دەسووتێتو و کۆرپەکەت بۆ دەگەڕێنێتەوە"، دایکەکە بەپەرۆشەوە دەرچوو تاوەکو گەیشتە لای سولْتان سەلاحەددینی ئەیوبی کە لەسەر تەپۆلکەی (الخروبە) بوو، شکایەتی دزرانی منداڵەکەی لا کرد و بەگوڕ ئەگریا، سولْتان تا ئەو ڕادەیە هەستی ناسك بوو کە چاوەکانی فرمێسك گرتنی و فەرمانی دەرکرد منداڵەکەی بۆ ئامادە بکەن، کەچی لە بازاڕ فرۆشرابوو، فەرمانی دەکرد کە پارەی کڕیارەکە بگەڕێنەوە و منداڵەکەی وەرگرنەوە، بەهەرحاڵ دایکەکە منداڵەکەی وەرگرتەوەو لەباوەشی ناو لەناو خۆشیدا زۆرگریا، پاش ئەوە بۆ سەعاتێك شیری خۆی پێدا، سەرەنجام بڕیاری دەرکرد کە خۆیو منداڵەکەی بە سواری ئەسپێك بە پارێزراوی بگەڕێننەوە لای کەسو کاری دایکەکە. (ابن شداد: س.پ، ل١٩٦-١٩٧).

موسڵمانان هەبوو، بۆ نموونە ساڵی (٥٨٣ك/١١٨٧ز) سوپای ئەیوبی لەناوەڕاستی ڕۆژێکی هەینیدا بۆ شەڕی (حطين)دەستیان بە پێشڕەوی کرد، [١٨٢] هەروەها سوپای ئەیوبی لە ڕۆژی هەینی چووە نێو شاری (عكا) [١٨٣]، و قەڵا کەنارییەکانی باکووری شامو دوروبەری (أنطاكيا) [١٨٤]، ئەمەو جگە لەهەندێ شوێنیتر کە لەڕۆژانی هەینی دا بەدەستی سوپای ئەیوبی ڕزگار کرا، وەکو (جبلة) نزيك (اللاذقية) [١٨٥] لە کەناری شام لە ساڵی (٥٨٤ك/١١٨٨ز)دا هەروەها قەڵاکانی (اللاذقية، صهيون، بكاس، الشغر، سرمانية) [١٨٦]، ئەنجومەنی جەنگی سەلاحەددین هەمیشە پلانی بۆ ئەوە دادەنا کە شەڕەکانیان بکەوێتە ڕۆژانی هەینییەوە [١٨٧]، بێگومان ئەم ڕۆژە کاریگەری گەورەی لەسەر ورەو دەروونی سەربازانی سەلاحەددین هەبوو، لەڕاستیدا بۆ شەڕ کردن پاڵنەرو بزوێنەر بووە، ئەگەرچی سەرکەوتن و سەرنەکەوتن هیچ پەیوەندییەکی بەڕۆژەوە نییە، بەڵام دەربارەی سوپای سەلاحەددین ڕۆژانی هەینی لەسەریان کاریگەری دەروونی خۆی هەبووە، [١٨٨] سوڵتان سەلاحەددین لەکاتی شەڕەکانیدا ئەم شێوازە تاکتیکیانەی

---

١٨٢ ابن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٣٢٥" أبن شداد: س.پ، ل٧٥" أبوشامة: الروضتين، ج٢/ ل٨٠.

١٨٣ ابن خلكان: س.پ، ج٧/ ل١٧٥" ابن تغري بردي: س.پ، ج٦/ ل٣١.

١٨٤ العماد الكاتب: الفتح القسي، ل ٢٤٧" أبن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٣٢٨ " ابن شداد: س.پ، ل٩٢" أبن العديم: س.پ، ج٣/ ل١٠٤" أبوشامة: الروضتين، ج٢/ ل١٣٠.

١٨٥ أبن خلدون: تاريخ أبن خلدون، ج٥/ ل٣١٣.

١٨٦ ياقوت الحموي: س.پ، مج٣/ ل٢١٢، مج١/ ل٣٧٤، مج٣/ ل١٤٧، مج٣/ ل٤٢" أبن خلدون: تاريخ أبن خلدون، ج٥/ ل٣١٤. حسين: س.پ، ل٢٢١.

١٨٧ حسين: س.پ، ل٢٢١.

١٨٨ لەهەمان کاتدا ئەم سوپایە ڕۆژانی هەینی شکستو دۆڕاندنیشی بەخۆیەوە بینیوە، بۆ نموونە لە ساڵی (٥٧٣ك/١١٧٧ز) سوپای ئەیوبی بەدەستی خاچ دروشمەکان لە شەڕی (الرملە)شکستی هێنا، (أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل٥٨.) هەروەها لە ڕۆژی هەینی (١٧ی جمادی الاخرەی ساڵی ٥٨٧ك/١١٩١ز)دا خاچ دروشمەکان شاری (عكا)یان داگیر کرد،( ابن شداد: س.پ، ل١٧١" أبوشامة: الروضتين، ج٢/ ل١٨٨" أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل٣٦٠).

لەچوار چێوەی ئامانجە تەکتیکیە دەروونیەکانیدا لەپاڵ کردە سەربازییەکانی لە دژی خاچ دروشمەکاندا پیادە دەکرد.

بۆیە لە کۆتاییدا دەتوانین بڵێین ئەم جۆرە جەنگە پەیوەست بەکات و شوێن و تاقم و دەستەیەکی دیاریکراوە مەبەست و ئاکامەکانی کورتن و کاریگەریەکەی لەماوەیەکی کورتدا دەردەکەوێت، بۆنموونە لەکاتی شەڕدا ئەم جۆرە ئاراستەی سەربازەکان و مەدەنیەکانی دوژمن دەکرێت بۆ خۆبەدەستەوەدان و شەڕ نەکردنیان و ئیفلیج کردنی وورەیان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەم جەنگە.

ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە خاچ دروشمەکان لە ماوەی هەڵمەتەکانیان بۆ سەر ڕۆژهەلات جەنگی دەروونی تەکتیکیان لە دژی سوپای ئەیوبی بەکار نەهێنابێ، بۆ نموونە لەکاتێکدا کە هەڵمەتەکەی ئەڵمانیا بەسەرکردایەتی (بەربەرۆسا)[189] لە وشکانیەوە گەیشتە ناوچەی شام[190]، کەشێکی ترسناکیان بەسەر وڵاتانی ئیسلامی دا هێنا.

سەلاحەددین چەندین ئیجرائاتی مەیدانی کرد کە کاریگەری دەروونی و وورەیی چاکیان لەسەر موسڵمانان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەم مەترسیە هەبوو، وەك ناردنی سیخوڕ بۆ زانینی هەواڵی دوژمن[191]، و چۆڵ کردنی شارەکان و ڕووخاندنی شوراکان وەکو شورای (طبرية) و چەندین شورای

---

١٨٩ فردریك بەربەرۆسا: لە پاش مردنی مامی (کۆنرادی سێیەم)سالی (٥٤٧ك/١١٥٢ز)، فەرمانڕەوایی ئەڵمانیای گرتە دەست، بە یەکێك لە بەهێزترین کەسایەتیەکان دادەنرێت کە دەسەلاتی ئەلمانیایان وەرگرتووە، لە سالی (٥٨٦ك/١١٩٠ز)، بەشداری لە هەلمەتی سێیەمی خاچ دروشمەکان کرد، بەلام ئامانجەکانی نەهاتەدی، لە کیلیکیا خنکا و سوپاکەی لەناوچوو .( زیان: الامبراطور فردريك بربروسا و الحملة الصليبية الثالثة، ل١٢).

١٩٠ قاسم: س.پ، ل١٤٥.

١٩١ أبو شامة: الروضتين، ج٢/ ل١٥٠.

تری شارەکانی وڵاتی شام[192]. ئەوەندەی پێ نەچوو ڕووداوێکی کتوپڕ ڕوویدا و هەموو شتێکی لە کاتی پەڕینەوەی (بەربەرۆسا) لە ڕووبارێکی بچوك لە (قیلیقە) بەسەریەکدا تێکدا، ئەویش لە ڕێگای (طرطوس)ەوە بۆ (أدنە و أنطاکیة)نغرۆبوو[193]. موسڵمانەکان زۆر دڵخۆش بوون بە خنکانی ئیمپراتۆری ئەڵمانی، (أبن الاثیر) لەم بارەیەوە دەڵێت: "ئەگەر بەزەیی و بەخشندەیی خودا نەبووایە بەرامبەر موسڵمانان، و شای ئەڵمانیای نەخنکاندایە، ئەوا ئەگەر بگەیشتایەتە وڵاتی شام دەبوایە بگوترایە شامو مصر لەکۆندا وڵاتی موسڵمانان بوون"[194].

کەچی لەڕێگەی دەریاوە کەشتیەکی خاچ دروشمەکان هات، (٣٠٠) ژنی خاچی تێدابوو "کە هەموویان گەنجو جوانو ڕازاوە بوون لە دوورگەکان دابەزین، خۆیان ئامادە کرد بۆ دڵخۆشی کردنی لاسارانو بڵاوکردنەوەی گەندەڵی، و خۆیان جوان کرد بۆ ئەوەی خەریکی داوێن پیسی بنو بازاڕیان هەبێت"[195]. ئەم دەقە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە خاچ دروشمەکان (سێکس)یان وەك جەنگی تەکتیکی دەروونی لە هەڵمەتی سێیەمیاندا دژ بە ئەیوبیەکان بەکار هێناوە، بۆ ئەوەی لە ئەرکی جیهاد دووریان بخەنەوە، ئەوان خێوەتی خۆیان لە نزیك سەربازگەی موسڵمانەکان دابەستو ئەوە وای لەهەندێ سەربازە گەنجەکانی کرد کە بچن بۆ ناو ئەو خێوەتانەو هەندێ کاری حەرام کراو ئەنجام بدەن. (العماد الکاتب) لە وتەیەکیدا بەم جۆرە وەسفی کردوون: "ئەم هەواڵە لەناو ڕیزی سەربازەکانمان بڵاوبیوەوە، هەندێ لە مەمالیکە کەللەپوتەکان و هەندێ لە نەفامەکانو، کۆمەڵێك ئارەزووی هەڵینان، شوێنی

---

١٩٢ هـ.س، ل١٥٧.

١٩٣ ابن الاثیر: الکامل، مج٧/ ل٣٧٤.

١٩٤ هـ.س، ل٣٦٣.

١٩٥ العماد الکاتب: الفتح القسي، ل٢٢٨-٢٢٩" العلیمي: س.پ، ج١/ ل٣٦٢.

بەڕەلایی کەوتن، هەندێکیان ئەوەیان پێ خۆش بوو و هەندێکیان لەم ڕەفتارەیان پەشیمان بوونەوە"[196]. لێرەوە دەتوانین بڵێین کە خاچ دروشمەکان سێکسیان لەم جەنگەدا وەکو تازەترین چەکی تەکتیکی دەروونی بەکارهێنا کە بۆخۆی ئاڕاستەی بڕواو ئازایەتیو متمانەو دژ بە ئارەزووی شەڕ کردن کرا.. کەتوانی گیانی ورە لە موسڵمانەکان تێك بدا. ئەڵێن ئەو ژنە زینا کارانە چوونەتە شاری (عکا) کە لەژێر دەستی خاچ دروشماندا بووە، ئیتر شارەکە بووە خانەیەکی گەورەی داوێن پیسی بەجۆرێك کە باسی ناکرێت. پاش ئەوە لە(عکا) ئەو ژنانەی بەرەو (یافا)و هەندێ ناوچەی نزیك سەربازگەی موسڵمانەکان دەنارد، هەتاوەکو شاعیری خاچیەکان (ئەمروز) کە هاوچەرخی ڕووداوەکان بوو بەو کارە دڵ گران بووەو وتویەتی: "خوایە میهرەبانی خۆت، بەم جۆرە ڕەوشتە، میراتی خواوەند دەگێڕنەوە"[197].

ئازاردانی دیل لەلایەن هەردوو لاوە (خاچیەکانو موسڵمانەکان) یەکێك بوو لە شێوازە تەکتیکە دەروونیەکان کە بۆ ترساندنی سەربازو غەیرە سەرباز واتە خەڵکی مەدەنی بەکار دەهێنرا، ئەم شێوازە بەشێوەیەکی بەرچاو پاش کەوتنی (عکا) بەدەستی خاچ دروشمەکان دەرکەوت، بەتایبەت دوای ئەوەی نزیکەی (٣)سێ هەزار دیلی موسڵمانیان کوشت بە فەرمانی

---

١٩٦ الفتح القسي، ل٣٤٨.

١٩٧ وەرگیراوە لە النقاش: س.پ، ل١٥٢-١٥٣.

(ریچاردی شێردل) و (یزك)[198]ی موسڵمانەکان تەماشای دەکردن‌و لەتوانایدا نەبوو هیچ بکات[199].

ئەم شێوازە ترسناکە کارتێکردنی گەورەی لەسەر دەروونی سەلاحەددین‌و ورەی میرو سەربازو خەڵکی مەدەنیش هەبوو... سەلاحەددین بیری لەوە کردەوە بە شێوازێکی نوێ وەلامیان بداتەوە لە ڕێگەی (یزك)ی موسڵمانەکانەوە فەرمانی بە دزینی چەند کەسانێکی خاچ دروشمەکاندا تاکو لە پاشاندا بیانکوژێت[200].

بەم جۆرە کەسانی (یزك)ی ئەیوبی فێری پەلاماری لە ناکاو و ڕفاندن‌و دزینی کەسی دیاری کراو بوون و لەپاشان کوشتنی ئەو کەسانەی دەدزران بەمەبەستی ئەوەی بیان ترسێنن و ترس‌و لەرز بخەنە دڵیانەوە ورەیان بڕوخێنن، گومانی تیا نییە کە پەنا بردنی سەلاحەددین بۆ ئەو شێوازە تەکتیکیە نوێیە لەبەر ئەوەبوو، چونکە سوپاکەی تووشی شکستێکی زۆر بوو، مەبەستی لەم تەکتیکە ئەوە بوو لە جیاتی ئەوەی لەگەڵ دوژمن بکەوێتە شەڕێکی ڕاستەقینەی گەورەوە هەڵسا بە پەرێشان کردن‌و ماندوو کردنیان[201]. لەکاتی چوونیان لە (عکا)وە بەرەو (عسقلان) توانیان دوو لە خاچ دروشمەکان بدزن و بڕیار درا سەریان بڕن، لە نزیك (قیساریە)وە دوانی تریشیان هێنا، تاوەکو ئەو ڕۆژە (٥ی شعبانی ٥٨٧ك/١١٩١ز)

---

١٩٨ یزك:زاراوەیەکی فارسیە، بە واتای پێشەنگی سوپا دێت،(ادی شیر: الالفاظ الفارسیة المعربة، ل١٦٠" التونجي: المعجم الذهبي، ل٦١٩)، هەروەها بەو تیپانە دەوترێت کە ئاشکراکردنی هەواڵی دوژمنی پێدەسپێردرا پێش چونە ناو شەڕەکە، یان پاسەوانی پێشەوای سوپا ، یاخود سیخوڕ.( بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە ئەمین: الاستخبارات الایوبیە، ل١٦٢"حسین: س.پ،ل١٧٧).

١٩٩ ابن شداد: س.پ، ل٢٢١-٢٢٢. بۆزیاتر زانیاری بڕوانە (زابوروف: الصلیبیون في الشرق، ل٢٠٩" لامپ: س.پ، ل٢١٧).

٢٠٠ ابن شداد: س.پ، ل١٩٦-٢٢٤.

٢٠١ حسین: س.پ، ل٢٣٦.

گەیشتە (٨) دیل، دوای ئەوەی توانیان (١٤)کەس لە خاچ دروشمەکان بگرن، و ژنێکیان لەگەڵ بوو کە کچی یەکێك لە سوارچاکە خاچ دروشمەکان بوو کە دواتر هەموویان کوشتن[٢٠٢].

بەڵام خاچ دروشمەکان لە دزین و پەلاماری لەناکاودا بەهێزترو بە تواناتر بوون، چونکە (ریچارد شێردڵ) نەیدەویست بەوەڵامدانەوەی ئەو پێکدادانەوە خەریك بێت و هەڵەکە لەدەست بدات، ئەو دەیویست بگاتە ئامانجە سەرەکییەکەی خۆی کە قودس و وڵاتی مصر بوو[٢٠٣].

ئەمەش شێوازێکی تری تەکتیکی جەنگی دەروونی بوو کە پێویستی بەشارەزا بوونی رادەی رۆشنبیری دوژمن بوو، بۆ بڵاوکردنەوەی ئاژاوە لەنێوان ریزەکانیاندا بەو جۆرەش تووشی دڵە راوکێیان بکەن، لەهەل و مەرجێکدا کە هیچ تاکتیکێك بۆ هەڵوەشاندنەوەی پیلانەکانی دوژمن نامێنێ پێویستە بۆ تۆڵەکردنەوە شتە پیرۆزەکانی دوژمن رەچاوبکرێت، ئەگەر سوود لەو کارە وەرگیرا بەلەبەر چاو گرتنی مەرجەکان ئەو شتانە دوژمن تێك دەدات و لەهەمان کاتیشدا بیرو هۆشی شپرزە دەکات[٢٠٤].

شەڕی (أرسوف) بەیەکەمین شەڕ دادەنرێ کە موسڵمانەکان تێیدا پاش کەوتنی شاری (عکا) تووشی شکست هاتن.. کە خۆی لەخۆیدا بۆ خاچ دروشمەکان سەرکەوتنێکی مەعنەوی گەورە بوو[٢٠٥].

ئەو شەڕە ئەوەی سەلماند کە ئەو داکشانە بە تایبەتی دوای کەوتنی (عکا) وە خۆڕاگری شاری (صور) بە بەرژەوەندی خاچ دروشمەکان

---

٢٠٢ أبن شداد: س.پ، ل٢٢٦-٢٢٨.

٢٠٣ حسين: س.پ، ل٢٣٦-٢٣٧.

٢٠٤ زماني: س.پ، ل١٦٠.

٢٠٥ العماد الكاتب: الفتح القسي، ل٥٤٤" أبن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٣٨٨" أبن شداد: س.پ، ل٢٣٧" أبو شامة: الروضتين، ج٢/ ل١٩١" أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل٣٦٨" حسين: س.پ، ل٤٧٦" حسن: س.پ، ج٤/ ل١٠٧.

شکایەوە، ئەگەری گەیشتن بۆ (بیت المقدس) لە جاران زیاتر بوو، ناوبانگی (ڕیچارد شێردڵ) گەیشتە لوتکە[٢٠٦]، بەجۆرێك موسڵمانەکان دەترسان لە (ڕیچارد) و ترس و نیگەرانی باڵی بەسەر ئەنجومەنە جەنگیەکەی سەلاحەددیندا کێشابوو، بەتایبەت دوای ئەوەی بڕیاریاندا شاری (عسقلان) چۆڵ کەن و خاپوریشی بکەن[٢٠٧].

بێگومان ئەم بیرکردنەوەیە کە باڵی بەسەر بیر و هۆشی هەندێ لە میرەکانی (سەلاحەددین)دا کێشابوو، ڕادەی ئەو ترسە زۆرە دەسەلمێنێ لە هێزی خاچ دروشمەکان، لەهەمان کاتدا ڕەنگدانەوەیەکە بۆ ئەو بارە دەروونیە نالەبارەی کە تیایدا دەژیان، ئەو میرانەی بانگەشەیان بۆ خاپوور کردنی (عسقلان) دەکرد ئەوەیان ڕاگەیاند کە داکۆکی کردن لە شارەکە پێویستی بەهێزێکی پارێزەری گەورەیی کە ژمارەیان نزیکەی (٣٠) هەزار سەرباز،[٢٠٨] یان (٢٠) هەزار بێت. سەلاحەددین نەیتوانی میرەکانی ڕازی بکات، بۆیە زۆر دڵتەنگ بوو، و ئەوشەوەیشی بە پەژارەوە بەسەر برد، (أبن شداد) دەڵێت: "سەلاحەددین شەو زۆر بەکەمی خەوت، بانگی کردم لە خزمەتی دابم تاوەکو درەنگانێ.. ئامادەبووم کوڕەکەشی (الملك الافضل) ئامادەبوو لەو بارەوە پرسیارم لێکرد، پاش ئەوە وتی: "بەپەروەدگار لەدەست دانی منداڵەکانم هەموو پێخۆشترە لەوەی تاکە بەردێکی (عسقلان)

---

٢٠٦ رنسيمان: س.پ، ج٣/ ل١١١" العريني: الشرق الادنى، ج١/ ل٩٦٥.

٢٠٧ أبن شداد: س.پ، ل٢٤٠" أبن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٣٨٨" أبو شامة: الروضتين، ج٢/ ل١٩٢" الحنبلي: س.پ، ل١٧٢.

٢٠٨ العماد الكاتب: الفتح القسي، ل٥٥٠" أبو شامة: الروضتين، ج٢/ ل١٩١" أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل٣٦٩" سبط بن الجوزي: س.پ، ج٨/ ل٤١٠.

بڕوخێنن، بەڵام ئەگەر ئەوە قەدەری خواوەند بێت و بەڕێگەی چارەی پاراستنی بەرژەوەندی موسڵمانەکان داینابێت چی بکەم"[209].

سەلاحەددین ڕەخنەی لەم بۆچوونە گرتو داوای لەهەندێ لە میرەکان کرد بچنە (عسقلان)و بۆ داکۆکی کردن لە شارەکە و خۆیان ڕێکبخەن... ئەوەیان نەکرد بگرە بەجۆرێکی نائاسایی وەڵامیان دایەوەو لەو ڕۆژەوە بەدواوە لەسەری ڕاهاتن بەجۆرێك پێیان ووت: "ئەگەر دەتەوێت بیپارێزیت خۆت یان هەندێ لە کوڕە گەورەکانت لەگەڵماندا بێنە شارەکەوە، ئەگینا کەسمان ناچین نەوەك وەك خەڵکی (عکا)مان بەسەربێت"[210]، لەئەنجامدا ناچار بوو ملکەچی بڕیاری میرەکان بێت بەخاپوور کردنی (عسقلان) لە ساڵی (٥٨٧ك/١١٩١ز). ئەمەش لەئەنجامی داڕوخانی پەیوەستی دەروونیان بوو لەپاش شکستەکەی (ارسوف)و بڵاوکردنەوەی ناوبانگی (ریچارد) وەك سەرکردەیەکی سەربازی لە گۆڕەپانی شەڕدا بەتایبەت لە ئاراستە کردنیدا بۆ شەڕێکی دەروونی دژ بە بڕواو زیرەکیو ئارەزووی شەڕکردن... بەجۆرێك بیانخاتە ژێر ئەو کاریگەرییەی کە ئیدی شەڕ بێ هودەیە، بێگومان لەبەر بوونی هەندێ سەرکردەی بێ ئەزموون بەجۆرێك گومانیان لەسەرکردایەتیو توانای سەربازی سەلاحەددین هەبوو، هاوکات موسڵمانەکان بە خاپوور کردنی شاری (عسقلان) زۆر دڵگران بوون[211].

لەم ڕووداوەدا ڕادەی ئەو ترسە زۆرە لە (ریچارد)و توندوتیژیو دڕندەییەکی دەردەکەوێت کە تووشی هاوڕێکانی سەلاحەددین بووە بە

---

٢٠٩ النوادر السلطانية، ل١٨٦" أبو شامة: الروضتين، ج٢/ ل١٩٢" أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل٣٦٩" أبن خلكان: س.پ، ج٧/ ل١٩٨" ابن تغري بردي: س.پ، ج٦/ ل٤٣" حسين: س.پ، ل٤٧٨.

٢١٠ العماد الكاتب: الفتح القسي، ل٥٥٠" أبن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٣٨٨" أبو شامة: الروضتين، ج٢/ ل١٩٢" الحنبلي: س.پ، ل١٧٢.

٢١١ أبن شداد: س.پ، ل٢٤١" أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل٣٦٩.

جۆرێـك هـەتاوەكو بـۆ داكـۆكی كـردن قایـل نـەبوون بـچنە نـاو شـاری (عـسقلان)ەوە، لەترسـی ئـەوەی نـەوەك ڕووبـەڕووی هـەمان ئـەو كارەسـاتە ببنەوە كەبەسەر خەڵكی شاری (عكا) داهات.

ئەو شەڕانەی كە لەچواردەوری شوراكانی (عكا) بەرپا بوو لە گەورەترین ئـەو شـەڕانەیە كـە لەمێـژووی سـەدەكانی ناوەڕاسـتدا ڕوویـان داوە، و لەسەرنجڕاكێـشترینو گەرمترینیانـە لـە مێـژووی ڕۆژهـەڵاتو ڕۆژئـاوادا، دڕەندایەتیو ناشرینی لە خەسڵەتەكانی ئەم شەڕانە بوو هەتاوەكو هەردوو لایەن بە ئاگر تێبەردان دیلیان دەسووتاند، (العماد الكاتب) ئاماژەی بۆ ئەوە كردووە كە "لەیەكێك لەو شەڕانەی كە لەچواردەوری شاری (عكا) ڕوویـدا.. خـاچ دروشمـەكان یـەكێكیان لـە موسـڵمانەكان بـەدیل گـرتو سـووتاندیان، ئێمـەش یـەكێكمان گـرتو لەتۆڵـەی ئـەوە سـووتاندمان، هـەردوو ئاگرەكـە پێكـەوە دەبینـران كـە جەسـتەی هـەردوو دیلەكـە دەسـووتان، دوورتـریش بەرامبـەر بەیـەك دەجـەنگان"[٢١٢]، ئەوەبۆخۆی جەنگێكی تـەكتیكی دەروونـی بـوو لـە مـاوەی بـەڕێوە چـوونی شـەڕەكەدا لەلایـەن هـەردوو بـەرەوە ئـەنجام دەدرا، بـۆ جێبـەجێ كردنـی ئامانجـەكانیان وەك بەشـێك لـە كـرداری شـەڕی ڕاستەقینەو هەوڵ دان بۆ بەرزكردنەوەی وورەی شەڕ كەران، لەبەر ئەوەی ئـەو جەنگە تەكتیكیە دەروونیە كاریگەری خۆی هەیە بۆ هەر لایەنێكی سەربازی بەتایبەت بۆ ڕووخاندنی گیانی مەعنەوی لە گرنگترین ئەو ئامانجانە بوو كـە هـەردوولا (خـاچ دروشمـەكانو ئەیوبیـەكان) كاریـان بـۆ جێبـەجێ كردنـی دەكـرد، جـا لەشـەڕ كـردن یـان بەتـەكتیكی جـەنگی دەروونـی لـەكاتی شەڕكردندا بێت.

---

٢١٢ الفتح القسي، ل٤٩٣.

## راگەیاندنی دەروونی

راگەیاندن وەکو چالاکییەکی ڕۆژانە هەر لە سەرەتای دروستبوونییەوە شان بەشانی چالاکییە ئابووری و کۆمەڵایەتیەکانی تری ژیانەوە بەشێکی گرنگی هەڵس و کەوتی مرۆڤ بووە، لەناو کۆمەڵگاشدا کەسانێك هەبوون کە بایەخیان پێدەدا، لەبەر پێویستی پێکەوە ژیان و کاریگەریەکەی لە بەرەو پێش بردنی ژیاندا لە هەموو شوێنە ئاوەدانەکانی جیهاندا.[1] سەرەتا مرۆڤ راگەیاندنی بە شێوەیەکی ساکار پیادە کردووە پێش ئەوەی پەنا بباتە بەر زمان وەکو لە م ئایەتە هاتووە { فَبَعَثَ اللَّهُ غُرَاباً يَبْحَثُ فِي الْأَرْضِ لِيُرِيَهُ كَيْفَ يُوَارِي سَوْءَةَ أَخِيهِ قَالَ يَا وَيْلَتَى أَعَجَزْتُ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ هَذَا الْغُرَابِ فَأُوَارِيَ سَوْءَةَ أَخِي فَأَصْبَحَ مِنَ النَّادِمِينَ}[2]. ئەمەش یەکەم پرۆسەی ڕاگەیاندن بووە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، کە بەتێبینیو هێما و دواتر قسە کردن پەرەی سەندووە، مرۆڤ هەر لە سەرەتاوە شێوازی جیا و هەمەجۆری ڕاگەیاندنی بەکار هێناوە، وەك ئاگر کردنەوەو دوکەڵو هاوارکردن و دەنگدانەوە بۆ ئاماژە کردن بە ڕووداوێك هەروەها دەهۆڵو کەمۆڵەی[3] بەکار دەهێنا[4].

بۆیە دەتوانین بڵێین راگەیاندن لە جەنگی دەروونی هەموو ئەو پەخش کراوانەی بەرامبەر دەگرێتەوە کە بەکاری دەهێنێ بۆ رووخاندنی ورەی

---

١ عبدالقادر: دور الاعلام في التنمیه، ل١٩.

٢ واتە(خوا قەڵە ڕەشێکی نارد، خەریك بو زەوی دەکوڵی بۆ ئەمەی پێی نیشان بدا کە چۆن جەندەکی براکەی لە خاکا بشارێتەوە. گوتی: ئەی لەخۆم نەگبەتی" چۆن نەمزانی وەك قالا بجولێمەوە وە لاشەی برای خۆم وشێرم. (بەم کردەوەی) دەڵێی هاتە ڕیزەی پەشیمانان). (سورەتی مائیدە: ئایەتی ٣١، وەرگێرانی مامۆستا هەژار).

٣ کەمۆڵە: شاخی گا بوو فوی تێدەکرا و بۆ ئاگادارکردنەوە وەك هۆکارێکی راگەیاندن بەکار دەهێنرا.

٤ الرضا: الرأی العام والاعلام والدعایة، ل٩٤" سعید: الاعلام والمعرکة بین الامس والیوم، مجلة دراسات للاجیال، عدد ٤٠، تشرین الثاني، بغداد، ١٩٨٠، ل٤٢.

دوژمن جاله ڕێگەی هەر هۆکارێکی ڕاگەیاندنەوە بێت. ڕاگەیاندنی دەروونی بەکارهێنانی پلانێکە لەلایەن دەوڵەتەوە بۆ پڕوپاگەندە کردن دژی کۆمەڵێکی تر کە دۆست بێت یان دوژمن بۆ کار کردنە سەر سۆزو هزرو ڕەفتاریان بە شێوەیەك کە لە خزمەت بەدەستهێنانی ئامانجە سیاسیەکانی دەوڵەتدا بێت[5]. لەڕێگەی جەنگان لە تەك دوژمنداو داڕماندنی پیلانو مەبەستەکانی و بەهێز کردنی بەرەی ناوخۆ کە لەلایەن دوژمنەوە بۆ شکست پێهێنانی دەوڵەت، یان تواناکانی وڵات بەشتێکی گرنگ دادەنرێ.

لە ڕوانگەی بەشەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا لە مەڕ جەنگی دەروونی بۆمان دەردەکەوێت کە ڕاگەیاندن هۆیەکی گرنگە بۆ ئاسان کردنی جەنگی دەروونی و شێوەکانی بۆ کارکردنە سەر ئەو لایەنانەی کە پێویستە ئاراستە بکرێن، بەکار هێنراون، بەبێ ئەوەی واز لەبەکارهێنانی هێزی سەربازیو لایەنی ئابووریو ڕامیاری بهێنرێت، چونکە ڕاگەیاندن هەموو ئەو لایەنانە دەگرێتە خۆ لەبەر ئەوەی لایەنی هاوبەشی لەگەڵ هەموویاندا هەیە و گەیەنەری سەرەکییە بۆ کارکردنە سەر لایەنی بەرامبەر بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکان[6]. ڕاگەیاندن گەیەنەری هەواڵی سوپا و دەنگو باسی جەنگە، هەروەها کار دەکاتە سەر کەمکردنەوەی سەرکەوتنی سەربازی بەرامبەر یان سنووردار کردنی یان زیادە ڕەوی لە باس کردنی دۆڕاندنەکان[7]. هەروەها کار دەکاتە سەر ئابلۆقەی ئابووری بەمەبەستی ئەنجامدانی ئامانجێکی دیاری کراو، و گەورە کردنی توانای سەربازی دەوڵەتێکی دیاریکراو بەمەبەستی ناچار کردنی خەڵکانی تر کە هاوشانی ئامانجەکانی بڕۆن[8].

---

٥ شلبی: حرب الكلمات، ل١٩.

٦ العوينى: الاعلام الدولى بين النظرية والتطبيق، ل١٢.

٧ كحيل: الرأى العام والسياسات الاعلامية، ل١٤٠.

٨ الحسن: الدولة الحديثة اعلام واستعلام، ل٢٨٦.

ڕاگەیاندنی دەروونی هەوڵ دەدات بۆ ڕووخاندنی دوژمن‌و نەهێشتنی ورەو لەکەدار کردنی هەموو ئەو بانگێشانەی کە دوژمن پشتی پێ دەبەستێت، هەروەها هەوڵ دانە بۆ بەدەستهێنانی پشتگیری دۆست و بەرگریکردن لێی‌و بەهێز کردنی ئەو پەیوەندییە دۆستانەیە و هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی پشتگیری بێلایەنەکان بۆ لای ئەو مەسەلەیەی کە هەوڵی بۆ دەدرێت، و کار کردن بۆ بەدەست هێنانی متمانەیان و هەوڵدان بۆ دروست کردنی ڕق‌و دژایەتیکردنی دوژمن بەبەکارهێنانی هەوڵ بۆ بەدەستهێنانی ئاسایش‌و ئارامی‌و بەرزکردنەوەی ورەی بەرەی ناوخۆ و بەکارهێنانی بۆ دروستکردنی گەورەترین کێشە بۆ دوژمن‌و ڕووخاندنی ورەی دوژمن‌و گۆڕینی هەواڵەکانیان بۆ پڕوپاگەندە[9].

جەنگی دەروونی چەندین هۆکاری جۆراوجۆری ڕاگەیاندن بەکار دەهێنێ بۆ ئەوەی بگاتە خەڵك‌و کار بکاتە سەریان، و پێویستە ئەوەش بزانین کە جەنگی دەروونی بە گۆڕانی خەڵك‌و شێوازەکەی دەگۆڕێت[10]. ئەگەر هەموو ئەرکەکانی بخەینە سەروی ڕێگەکانی لە گواستنەوەی بیرۆکەو هەواڵ‌و زانیاری پێویستی خەڵکی بۆی لە بەدواداچوون و تێر کردنی پێویستیەکانی، هەروەها لەم بوارەدا ڕاگەیاندن کاریگەرترین چەك دەبینی لە جەنگی دەروونی دا[11]. بۆیە دەتوانین بڵێین ڕاگەیاندنی ڕۆڵی دەروونی هۆیەکە بۆ گەیاندنی شێوازەکانی جەنگی دەروونی بۆ لایەنەکانی مەبەستدار. لە ڕاگەیاندندا دیاریکردنی ئامانج بنەمایەکی گرنگە، بۆیە لە بنیاتنانی ڕەوشتی کۆمەڵگا لە ڕوانگەی ئامانجە بەرزەکانەوە ئامانجی

---

٩ شلبي: س.پ، ل٥٠.

١٠ المتوكل: مدخل الى الاعلام والرأى العام، ل١٠.

١١ ذبيان: الصحافة اليومية والاعلام، ل١١٣.

راگەیاندن دیاری دەکریّ[١٢]. دیاریکردنی ئامانج و راگەیاندن لە بنەما سەرەکیەکانە لە جەنگی دەروونی لە راگەیاندنی سەردەمی سوڵتان سەلاحەددیندا، چونکە ئامانجەکانی ڕوونن و لەگەڵ نموونەی شێوازی سەلاحەددیندا دەگونجیّ کە ئەمانە هەمووی لەو راگەیاندنانەدا کەلەبەردەستیدا هەبووە دەبینرایەوە، کە لەهەموو هەلّویستێکیدا دەخرانە ڕوو تاکو لەگەڵ ئامانجەکاندا لە چوارچێوەی دەوڵەتی ئەیوبیدا بگونجێن.
کاتێك کە جەنگی دەروونی چوارچێوە جوگرافیەکەی خۆی دەبڕیّ وا دەردەکەویّ مەبەستی بەسووکزانینی لایەنی بەرامبەرە، کەواتە راگەیاندنی دەروونی بریتییە "لەپێشکەشکردنی ڕاست و دروست بۆ خەڵکی بەمەبەستی یارمەتیدانیان بۆ دروست کردنی ڕایەکی دروست لە کاتی ڕوودانی کێشەیەکدا کە ئەم ڕایە، ڕایەکی بابەتی و ژیرانەیە و لەگەڵ بیرو لایەنەکانیان دەگونجێت"[١٣].

لەپاش کۆچی دوایی (نورالدین محمود) ساڵی (٥٦٩ك/ ١١٧٣ز)دا جیهانی ئیسلامی بوو بەچەند دەوڵەتۆکەیەك و ململانیّ کەوتە نێوانیانەوە تا لەم کاتانەدا سوڵتان سەلاحەددین دەرکەوت کە بۆ دووبارە بنیاتنانەوەو یەکخستنەوەی جیهانی ئیسلامی هەوڵیدەدا، کەلەوەو پێش لەدەستی دابوو بۆ زیندو کردنەوەی ئەو قەوارەیە لە سایەی دەوڵەتی ئەیوبییدا کاری دەکرد[١٤].

لە ڕاستیدا سوڵتان سەلاحەددین سەرکردەیەکی سەدەکانی ناوەڕاست بوو توانی زۆربەی لایەنەکانی سەربازی و ڕامیاری و کارگێڕی و کۆمەڵایەتی ڕێکبخات، و باشترین ڕیّ و شوێنی بۆ دابنێت، ئەوەی لە کەسێتی سەربازی

---

١٢ العوینی: س.پ، ل١٠.

١٣ حمزه: الاعلام والدعایة، ل٧٥.

١٤ ا.ر.جب: س.پ، ل١٩٣" فشر: تاریخ اوروبا العصور الوسطی،ل١٨٨.

(فردریك بەربەرۆسا)ی ئیمپراتۆری ئەڵمانیابوون[١٠٦]،لەو شێوازە ڕاگەیاندنە دەروونیانەی کە (فردریك بەربەرۆسا) بەکاری دەهێنا لەکاتی خۆئامادەکردن بۆ هەڵمەتی سێیەمی خاچ دروشمەکان نوسینی نووسراوێك بوو بۆ ئەو سەرکردانەی کە سوپاکەی بە وڵاتەکەیان تێدەپەڕێت وەکو پاشای (المجر-هەنگاریا) و ئیمپراتۆری (بیزنطی)، (أسحاق أنجیلیوس)و سوڵتانی سەڵجوقی (قلج ارسلان)و نامەیەکی بە نوێنەرێك بە ناوی (هنري دییتز) نارد کە هەڕەشەو گوڕەشە بوو لە سەلاحەددین و داوای لێدەکرد هەموو (فەلەستین)یان بۆ بگێڕێتەوە و لە گۆڕەپانی (صوعن)[١٠٧] ڕووبەڕووی ببێتەوە. لە ساڵی (٥٨٤ك/١١٨٨ز) نوێنەری (بیزنطي)یەکان گەیشتە (نورمبرگ) لە ئەڵمانیا بۆ خۆئامادە کردن و کۆکردنەوەی پێداویستی تەواو بۆ کارئاسان کردنی تێپەڕ بوونی سوپای خاچ دروشمەکان بە وڵاتی ئیمپراتۆری (بیزنطی)دا. هەروەها لە ساڵی (٥٨٥ك/تشرینی دووەمی ١١٨٩ز) پاشای (المجر)و سوڵتانی (سەلجوقی) وەڵامی داواکاریەکەی (فریدریك بەربەرۆسا)یان دایەوە و پەیمانی هاوکاریان پێدا. بەڵام وەڵامی سەلاحەددین بەهێز بوو، دەربارەی ئەم وەلامە (سعداوی)دەڵێت : "گیانی ئازایەتی عەشایەری کوردی و دبلۆماسیەتی ئەیوبیی مصری پێوە دیارە".[١٠٨] ئەمەش بۆخۆی شێوازێکی ڕاگەیاندنی دەروونی بوو کە سولتان سەلاحەددین لە دژی بەربەرۆسا پیادەی کرد. ڕاگەیاندنی جەنگی دەروونی لەکاتی شەڕدا هۆکارێکی گشت گیرو تەواوە لە هەڵوێستی سەربازی کە لە

---

١٠٦ گروسیة: س.پ، ل٧٦.

١٠٧ صوعن: ئێستا ناسراوە بە (صمان الحجر) لە ڕۆژهەلاتی ڕووباری نیل لە وڵاتی مصر ئەو شوێنەیە کە فیرعەون و موسا بەیەك گەیشتن. بڕوانە (رنسیمان: س.پ، ج٣/ ل٣٣ ).

١٠٨ التاريخ الحربي ، ل٢١٨.

هەموو کاتێکدا کاریگەری هەیە[109]، هەڵدەستێ بە ڕووخاندنی وەرەی هێزی دوژمن، هەروەها ڕاگەیاندنی دەروونی لەسەردەمی جەنگدا هەوڵدەدات بۆ ڕێگرتن لە ئەندامانی سوپاکەی بۆ ئەوەی نەچنە بەرەی دوژمنەوە،و هەوڵدان بۆ ئەوەی دۆستەکانی دوژمن بێ لایەن بکاتو کاریگەری کردنە سەر سوپای دوژمنەوە بەوەی کە بەرەنگاری هیچ سوودێکی نییە[110].

ئەمەی دواییان واتە ئیمپراتۆری ئەڵمانیا لە ماوەی بەڕێوە چوونی هەڵمەتی ناوبراودا جەنگێکی ڕاگەیاندنی دەروونی دژ بە سەلاحەددین بەرپا کرد، کاتێك نامەیەکی درێژی بۆ نووسی لە ساڵی (٥٨٤ك/١١٨٨ن) و داوای لە سەلاحەددین کرد دەست لە (بیت المقدس)و ناوچەکانی تری ڕۆژهەلات کە لەخاچ دروشمانی بووەوە هەڵبگرێت، (فریدریك) سەلاحەددینی لە مەترسی ئەنجامەکانی ئەم شەڕە ئاگادار کردەوە[111]، کەچی سەلاحەددین لەهەمان ساڵدا بەرامبەر بەوە بەجەنگێکی ڕاگەیاندنی دەروونی لە ڕێگەی نامەیەکی درێژەوە وەڵامی نامەکەی (بەربەرۆسا)ی دایەوە، نامەیەك کە حەماس و هێزو متمانەی سەرکەوتنی لێ ئەڕژا، کە بۆخۆی نیشانەی دیبلۆماسیەتێکی بەرزو گرنگیدانێکی بەرفراوان بوو بەسیاسەتی نێو دەوڵەتی هاوچەرخ دووپاتی کردەوە کە سوورە لەسەر بە زۆر گێڕانەوەی (صوروو طرابلس و أنطاکیا)و ئەو قەلایانەی خاچ دروشمەکان کە لەڕۆژهەلاتدا ماون، ئەگەر زوو بەزویی سەرکردەکانی خۆ بەدەستەوە نەدەن. هەروەها سەلاحەددین ئاماژەی بۆ پەڕینەوە لە دەریای ناوەڕاست کرد بۆ

---

١٠٩ نصر: س.پ، ج١/ ل١١٠.

١١٠ رشتی: س.پ، ل٢٧٣.

١١١ لەبەر ئەوەی زۆرێك لەگەلانی ئەوروپا هاوکاری دەبن و شان بەشانی هێرش دەکەنە سەر ڕۆژهەلاتو قەلاو شوێنەکانیان تەختی زەوی دەکەن و ماڵو گێلگەکانیان وێران دەکەن، ژنەکانیان دەبنو منالەکانیان هەتیو دەخەن.

داگیرکردنی خودی ئەوروپا، ئەگەر (بەربەرۆسا) پێ لەسەر هەڕەشەکردن لەسەر ئاشتی و ئاسایشی ناوچەی ڕۆژهەڵاتدا هەڵنەگرێت[112].

(ڕیچارد شێردڵ) شێوازێك لە شێوازەکانی جەنگی ڕاگەیاندنی دەروونی بەکارهێنا کە بریتی بوو لە کاری چەواشە کاری و فرت و فێڵ بۆخۆی و جارێکیان نوێنەری خۆی ڕەوانەی لای سوڵتان سەلاحەددین کرد[113]. پاشان خاچ دروشمەکان ناچار بوون کە لە (الرملە) ساڵی (٥٨٨ك/١١٩٢ز) بکشێنەوە و بۆ داواکردنی ڕێککەوتن و ئاشت بوونەوەو نوێنەریان نارد، کشانەوەی ڕیچارد کاردانەوەیەکی گەورەی هەبوو لە نێو ڕیزی موسڵمانەکان و سەلاحەددین هەناسەیەکی پیا هاتەوەو ورەی سەربازەکانیشی بەرزبیوەوە[114]. وەکو لەم ئایەتەدا هاتووە: { وَإِنْ جَنَحُوا لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ }[115] (ڕیچارد) نامەیەکی بۆ سەلاحەددین نارد، تێیدا هاتبوو "موسڵمانەکان هیلاك بوون و وڵات وێران بوو، موڵك و ماڵێکی زۆر بە فیڕۆ درا، خەڵکێکی زۆر کوژرا، ئەم کارەش هەقی خۆی بردو هیچ باسێك نەماوە تەنیا قودس و خاچ نەبێت. قودس پەرستگامانەو هەرگیز دەستبەرداری نابین و هەمووشمان لە پێناوی بکوژرێین وازی لێ ناهێنین، وڵاتەکان هەموومان بۆ دەگێڕنەوە، و خاچی خاچان لای ئێوە تەنیا دارێکە هیچ بەهایەکی نییە، بەڵام لای ئێمە زۆر پیرۆزەو سوڵتانەکان بۆ فەرمانڕەوایی بەکاری دەهێنن، دەمانەوێ لەو

---

١١٢ سعداوي: الحرب والسلام، ل٢١-٢٢.

١١٣ العماد الكاتب: الفتح القسي، ل٥٠١" ابن شداد: س.پ، ل١٥١.

١١٤ المقريزي: السلوك، ج١/ ل١٠٩" عاشور: الحركة الصليبية، ج٢/ ل٨٩٣.

١١٥ واتە :"ئەگەر داوای شەڕبەسیان کرد، قبولی کەو هەرخۆت بە خودا بسپێرە" هەر خۆی گوێدێر و زانایە". سورەتی ئەنفال، ئایەتی ٦١، وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار.

هیلاکیە پشوو بدەین"[116]. هەروەها (ڕیچارد) لەکاتی دانوساندنەکانی لەگەڵ سوڵتان سەلاحەددینی ئەیوبی شێوازی هەڕەشەو زۆری بەکار دەهێنا، بۆ نموونە بە سەلاحەددین دەڵێ: "بە دواکەوتنم لەخۆبایی مەبە، بەران دوا دەکەوێ بۆ ئەوەی قۆچ بووەشێنێ"[117].

سەلاحەددین لە وەڵامدا وتی: "قودس چۆن هی ئێوەیە ئاوا هی ئێمەشە،و لای ئێمە زۆر پیرۆزترە وەکو لای ئێوە، چونکە پێغەمبەرمان (د.خ) لەوێوە چوو بۆ ئاسمان و شوێنی کۆبوونەوەی فریشتەکانە، و باوەڕ ناکەم هیچ کاتێك وازی لێ بهێنین و ناکرێ باسی ئەو شتە لای موسڵمانەکان بکەین، بەڵام وڵاتەکانیش لە بنچینەدا هی ئێمەن و ئێوە بەشێوەیەکی کتو پڕ دەستان بەسەریاندا گرت، کەبەهۆی لاوازی ئەوکاتەی موسڵمانەکانەوە بوو، و لەناو چوونی خاچیش بەدەستی ئێمە کارێکی مەزنە، و ناتوانین واز لە هیچ شتێك بهێنین ئەگەر لە بەرژەوەندی گشتی موسڵمانان نەبێت"[118].

ئەگەر ناوەڕۆکی هەردوو نامەکە شی بکەینەوە دەبینین نامەی یەکەم بۆنی دۆڕاندنی لێ دێت لەلایەن (ڕیچارد)ەوە، کە ئاماژە بۆ هێما ئایینیەکانیان دەکاتو وەکو قودس و ئامادەن لە پێناویدا فیداکاری بدەن و بەوە کۆتایی پێ دێنێت کە سەلاحەددین خاچەکەیان پێ بداتەوە، و نامەی دووەم بە زمانێکی پڕ لەهێزو (منطق-لۆژیك) وەڵامی دەداتەوە و باسی مافێکی ڕەوای موسڵمانەکان دەکات. هەردوو نامەکە بەزمانێکی پڕوپاگەندەی ئایینی نوسراون کە لە ناوەڕۆکدا باس لەترسو تۆقاندن دەکەن لە پێناو بەدەستهێنانی دەسکەوتو شکانی بەرامبەر.

---

١١٦ أبن الفرات: س.پ، م٤ ج٢/ ل٣٩.

١١٧ بڕوانە (أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل٣٩٠-٣٩١).

١١٨ أبن الفرات: س.پ، م٤ ج٢، ل٣٩-٤٠.

## شێوازەکانی تری جەنگی دەروونی

هیچ سنوورێکی دیاریکراوو شێوازێکی تایبەت بۆ جەنگی دەروونی نیە، بەڵکو هەموو ئەم هۆیانە دەگرێتەوە کە لەپێکانی ئامانجدا بەکاردێن و پێیان دەوترێ شێوازەکانی جەنگی دەروونی[1]، لەگەڵ ئەوەشدا شێوازەکانی جەنگی دەروونی بۆتە زانیارییەکی گرنگ و پەیوەندی بەجەنگ و پڕوپاگەندە و توانا و سنوورەکانیەوە هەیە[2]، چونکە بۆ ئیفلیج کردنی ورەی دوژمنو کەم کردنەوەی توانای لەجەنگداو ترس خستنە نێو دڵەوە بەمەبەستی خۆ بەدەستەوە دانیان، ئەم جۆرە جەنگە لەشەڕو ئاشتیدا هەر بەردەوامەو پێش ڕوودانی شەڕ بەمەبەستی دابەزاندنی ورەی دوژمنو ناچارکردنی بۆ خۆ بەدەستەوە دان بەکاردێت[3]، چەندین لایەنی ژیان دەگرێتەوە لەوانە سیاسەتو ئابووریو کۆمەڵایەتی ... تاد، هەروەها جەنگی دەروونی بەترسناکترین جەنگ دادەنرێتو بۆ بەدەستهێنانو جێبەجێکردنی پلانێکی ستراتیژی، چونکە بەکارهێنانی پلانێکە بەمەبەستی کارکرنە سەر ڕاو سۆز و ڕەفتاری کۆمەڵە کەسێك پیادە دەکرێت[4]، لەسەردەمی دەوڵەتی ئەیوبیو بەتایبەتی لەسەردەمی سوڵتان سەلاحەددین دا چەندین جۆری جەنگی دەروونیو شێوازەکانی زۆر بە لێوەشاوەیی بەکارهێنراوە، و کاریگەری جەنگە دەروونییەکانی هاوشانو پاڵپشتی سوپا چەکدارەکەی بووە، بەکارهێنانی ئەم جۆرە جەنگەو شێوازەکانی هاوشانە یان لەگەڵ مەبەستەکانی جەنگی دەروونیو

---

١ الدباغ: المرجع فى الحرب النفسية، ل ٥٩.

٢ الدباغ: علم النفس العسكري، ل١٧٨.

٣ زهران: علم النفس الاجتماعي، ل ٣٥٦.

٤ عبدالله: الحرب النفسية و الشائعات، ل١٥.

تاقیکردنەوەکانیدا یەك دەگرێتەوە، ئەم تاقیکردنەوانە لە جەنگەکانی سەلاحەددینی ئەیوبی دا دژی خاچ دروشمەکان بەتەواوی ڕەنگی داوەتەوە[٥]، ئەو کارانەی کە سوڵتان سەلاحەددین لەوڵاتی شام و مصرو ناوچەکەدا کردی، پراکتیزە کردنێکی سەرکەوتووی جەنگی دەروونی بوو شان بەشانی ئەو جەنگانەی کە سوپاکەی دەیان کرد.

بۆیە بەدەست هێنانی ئەم سەرکەوتنانەی لەبەرەکانی شەڕدا بۆ پیادەکردنی (جەنگی دەروونی) دەگەڕێتەوە، بەلام لەسنوورو چوارچێوەیەکی دیاریکراودا، کە لەخزمەت ئەو ئامانجانەدا بێت کە هێزە چەکدارەکانی هەوڵی بەدەست هێنانی دەدەن[٦].

---

٥ نوفل: الحرب النفسية من منظور اسلامي، ل١٩٣.

٦ العسلي: فن الحرب الاسلامي، مج /٢ ل٢١٢ - ٢١٣.

## باسی یەکەم: جەنگی دەروونی بەهێزکراو Reinforced

ئەو جەنگە دەروونییەیە کە ئاڕاستەی گەلانی ناوچە ڕزگارکراو و داگیرکراوەکان دەکرێت، لەگەڵ بوونی چەندین ئامانج بۆ بەهێزکردنی کردە سەربازییەکان لەهەرێمی داگیرکراوی دوژمندا [7]، ئەوەش بۆ بەدەستهێنانی فراوانترین بوار لەهەماهەنگی کردنی مەدەنییەکان لەگەڵ هێزەکانی (سوپادا)، کە هەوڵ دەدات بۆ چەسپاندنی کۆڵەکەکانی ئەو سەرکەوتنانەی کە جەنگی دەروونی ستراتیژیو تاکتیکی بەدەستیان هێناون و گۆڕانی ئەم سەرکەوتنانە بۆ ڕاستیەکی تەواوو نەگۆڕ [8]، ڕێگەکانی ئەم بوارەش بریتین لە بەشداریکردنی کەرتی خزمەتگوزاری و بڵاوکردنەوەی ڕێنماییەکان بۆ پاراستنی ئاسایشو ئارامی و بڵاوکردنەوەی ڕاستیەکان و بەرپەرچدانەوەی پڕوپاگەندەو درۆو بایەخ دان بەو کارانەی کە لەپاشەڕۆژدا دوای تەواو بوونی شەڕ دەکرێن [9].

سەلاحەددین ئەم جۆرە جەنگە دەروونیەی پیادە دەکرد، بۆنموونە پاش وەرگرتنی دەسەلات لە وڵاتی مصر توانی لە ماوەیەکی زۆر کەمدا خۆی پێش بخات و هەموو کاروباری مصری خستە ژێر دەستی خۆیەوە، هەروەها بە ڕەوشتێکی باش لەگەڵ مصریەکاندا دەجولایەوە و زۆر ڕێزی لێدەگرتنو ماڵو دارایی بەسەردا دابەش دەکردن [10]، لەچوارچێوەی ئەو

---

٧ الدباغ: علم النفس العسكري، ل١٧٩.

٨ عبدالله: س.پ، ل١٨.

٩ الدباغ: المرجع فى الحرب النفسية، ل ٤٩.

١٠ أبن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٢١٧" أبن شداد: س.پ، ل٤٩" أبو شامة: الروضتين، ج١/ ل٧" المقريزي: الخطط، ج١/ ل٣٥٤" ابن تغري بردي: س.پ، ج٦/ ل٧" رفعت: س.پ، ل١٦٤.

جەنگـە دەروونیيـە بـەهێز كـراوە لـەناو هـەموو ئـەو بـاج و سـەرانەيەدا كەلەسەردەمی خەلافەتی فاتميەكاندا لەسەريان دانرابوو، توانی خۆی بكات بە خۆشەويسترين كەس، ئەويش بە لابردن يان سووككردنی باج و سەرانە لەسەريان[11]. هەروەها بەتاڵ كردنەوەی ئەو باجانە كەببوون بار گرانی لەسەر كۆمـەڵگا هـەروەك ئـەوەی مـيری شـاری (مكـە) بـە سـەر حاجييـەكانی سەپاندبوو، هـەروەكو (ابـن الاثـير)دەڵێـت: "گـەورەی (مكـە) فەرمانی دابوو پێشەكی حاجييەكان باجيان لە (جدە) بدەن"[12]، بەم كارەش ستەمێك بوو كـەوتبووە سـەر حاجييـەكان، پاشـان سـوڵتان سـەلاحەددينی ئـەيوبی ئـەم ياسـايانەی هەڵوەشـاندەوە بەچـەند شـتێك، قـەرەبووی بـۆ گـەورەی شـاری (مكـە) كـردەوە، لەوانـە هـەموو سـاڵێك بـاری (٢٠٠٠) دوو هـەزار عەلبـە دانەوێڵـەی بـۆ ڕەوانـە دەكـرد، بـەو مەرجـەی بەسـەر خـەڵكی شـاری (مكـەو مدينـە)دا دابەشـی بكـات، بـەم كارەش سـوڵتان سـەلاحەددين ئـەو گرانييـەی لەسەر خەڵك لابرد، بە ماڵی (بيت المال) قەرەبووی كردەوە بۆ خـەڵكی ئـەم دوو شـارە، بەهـەمان شـێواز لەگـەڵ دانيـشتوانی شـام و ناوچـەكانی تـر ئـەو كارانەی دەكرد[13].

---

١١ أبن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٢٠٢" ابن قاضي شهبة: س.پ، ل٢١٥" مجهول: مخطوطة تاريخية عن الدولة الايوبية، نسخة مصورة عن نسخة مكتبة الاوقاف في الموصل، ورقة ١٧. بڕوانە پاشكۆی ژمارە ( ٢ ).

١٢ الكامل، مج٧/ ل٢٠٢.

١٣ لـە كۆتـايی دەوڵـەتی فـاتمی دا بـڕی ئـەو باجانـە لـە رادەبـەدەر بـووە (القلقشندی: صبح الاعـشی،ج٣/ ل٤٦٦)، هـەموو شـتێكی دەگرتـەوە كـە كـڕين و فرۆشـتنی پێـدەكرا، تەنانـەت ئـاوی خواردنـەوەی روبـاری (النيل)يشی لێ بەدەر نەبوو.(ابن جبير: س.پ، ل٣١)، سەرەڕای دانانی باج لەسەر حاجيەكان لە كاتی حـەج كـردن (ابـن خلـدون: المقدمـە، ل٢٨١)، هـەروەها گەڕيـدەی ئەندەلوسـی (ابـن جـبير) بـاس لـەوە دەكـات كـە لـەكاتی سـەردانەكەی سـاڵی (٥٧٨ك/١١٨٢ز) دا بينيويـەتی دەڵێـت: "يەكـەم شـت كـە بينيمـان لـە رۆژی دووەمدا لە كاتی دابەزينمان لە شاری ئەسكەندەريە هاتنی كارمەندانی (ئەمينـداری كەشـتيەكان) بـوون بـۆ ناو كەشتيەكان لەلايەن سولتانەوە بۆ دەستنيشانكردنی هەموو ئەو كاڵا و كەل و پەلانەی كە تيايدا بووە، پرسياريان لە هەموو حاجيەكان دەكرد لەبارەی هـەموو ئـەو كـاڵا و شمـەك و دراوانـەی پێيـان بـوو بـۆ دانـی

**کاتێك خاچ دروشمەکان زانیان سەلاحەددین کراوەتە وەزیر، زۆر دڵگران بوون، بۆیە هەڵمەتیان بردە سەر (دمیاط و غزة) و گەمارۆیان دان، بەلام سەلاحەددین توانی تێکیان بشکێنێت، و بەوەشەوە نەوەستا ڕۆیشت تاکو بەندەری (عقبە)شی ڕزگارکرد کە دەکەوێتە سەر دەریای سوور لە دەروازەی مصر[14].**

**بەمە ڕێگای حاجییەکانی مصر کرایەوە و هاوکات بەبێ ترس دەیان توانی هاتووچۆ بکەن، دوای ئەوەی (مکوس)[15]ی لەسەر هەڵگرتن و بازرگانی مصری ئازاد کرد و بەهیچ شێوەیەك باج و گومرگ لە هەندێ لەو کاڵاو شت و مەکانە وەرنەدەگیرا[16]، لەچوارچێوەی ئامانجە دەروونییە بەهێز کراوەکەییدا ئەم شێوازە دەروونییە لای خەلیفەو مصریەکان خۆشەویستی کرد، وای لە خەڵکی مصر کرد کەدەست لە مەزهەبی شیعە هەڵبگرن و بچنە ژێر ئاڵای دەوڵەتی ئەیوبی بەسەرکردایەتی سەلاحەددین، و ببنە سەربازی خەبات کار بۆ بەرهەڵستیکردنی خاچ دروشمەکان و زاڵبوون بەسەر هەموو ئاژاواچیەکاندا[17].**

---

زەکات"، (رحلە ابن جبیر، ل١٣٠)، رەسمی مکوسی سەر حاجیەکان بەردەوام بوو تاکو لە سەردەمی سولتان سەلاحەددینی ئەیوبیدا لابرا، لە ساڵی (٥٦٧ك/١١٧١ن) سوڵتان سەلاحەددین زۆربەی مکوسە نا شەرعیەکانی سەردەمی فاتمیەکانی لە مصر و قاهیرەدا لابرد. (رحلە ابن جبیر، ل٣٠" أبو شامة: الروضتین، ج١/ ل٣٢٠" النویري: س.پ، ج٢٨/ ل٣٥٩" ابن تغري بردي: س.پ، ج٦/ ل١٣" بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە اسماعیل: بازرگانی میسر لەسەردەمی سەلاحەدینی ئەیوبیدا).

١٤ أبن الاثیر: الکامل، مج٧/ ل٢٠٧" ابن تغري بردي: س.پ، ج٦/ ل١٤.

١٥ مکوس: باجێکی سەرانەیە لە حاجیەکان وەردەگیرا کە بڕی (٧,٥) حەوت دینارو نیوی مصری بوو. (أبن جبیر: س.پ، ل٣٠-٣١).

١٦ أبو شامة: الروضتین، ج١/ ل٢٠٥" النویري: س.پ، ج٢٨/ ل٣٦٦" الصفدي: س.پ، ج٢٩/ ل٦١.

١٧ أبن الاثیر: الکامل، مج٧/ ل٢٠٢" أبن تغري بردي: س.پ، ج٦/ ل٧٢" نوري: سیاسة صلاح الدین، ل١٠٨-١٠٩.

بۆ نمونە سوڵتان سەلاحەددین بۆجێبەجێ کردنی ئامانجە دەروونییە بەهێز کراوەکەی خۆی، دەستی بە ئاوەدان کردنەوەی مصرو کردنەوەی نەخۆشخانەو دروستکردنی شورا کردو گەلێ خزمەتگوزاری تری ئەنجامدا. هەروەها بۆ بڵاوکردنەوەی مەزهەبی سوننی و گرنگیدان بە فقهی شافعی چوار خوێندنگای بەناوی (الناصریه[18] والمالکیه[19] و السیوفیه[20] و الصلاحیه[21])وە کردەوە، هەروەها (بیمارستان)ەکانی[22] چاککردەوە[23]. بەم شێوەیە هەر لەیەکەم ڕۆژەوە دەستی کرد بە ڕێگە خۆش کردن، بۆ لابردنی فەرمانڕەوایی فاتمیەکان و مصر بچێتە ژێر ئاڵای دەوڵەتی ئەیوبی و ڕزگارکردنی لە هەموو مەترسیەك، کە لەلایەن خاچ دروشمەکانەوە ڕووی تێبکردایە[24].

سەلاحەددین لە شاری دیمەشق شێوازێکی نویێ لە شێوازە بەهێز کراوە دەروونییەکانی گرتە بەر، هەوڵیئەدا لەچوارچێوەی ئامانجە دەروونییەکانی لایەنگری گەل بۆخۆی مسۆگەر بکات، یەکسەر فەرمانی خەرج کردن و دابەش کردنی پارەی بەسەر گەلدا دەرکرد[25]، و داوای لادانی باج و هەڵوەشاندنەوەی ئەو لایەنە دزێوو خراپانەی کرد لەپاش مردنی (نورالدین

---

١٨ ألنويري: س.پ، ج٢٨/ ل٣٦٣.

١٩ المالكية: پێی دەوترا (القمحية)، المقريزي: الخطط،ج٤/ ل١٩٣-١٩٤.

٢٠ المقريزي: الخطط،ج٤/ ل١٩٦.

٢١ السيوطي: حسن المحاضرة في اخبار مصر و القاهرة، ج٢/ ل١٤٢.

٢٢ بيمارستان: وشەیەکی فارسیە لە دوو برگە پێك هاتووە، (بیمار)بە واتای نەخۆش، و (ستان) بە واتای شوێن یان جێگا، واتا شوێنی نەخۆش،( المقريزي: الخطط،ج٤/ ل١٩٤" أبن منظور: لسان العرب، ج٦/ ل٢١٧" الشيال: تاريخ مصر الاسلامية، ج٢/ ل٥٢" عيسى بك: تاريخ البيمارستان في الاسلام، ل٤).

٢٣ ألنويري: س.پ، ج٢٨/ ل٣٦٣.

٢٤ ألنويري: س.پ، ج٢٨/ ل٣٦٤" ابن تغري بردي: س.پ، ج٦/ ل٧٢.

٢٥ أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل١٩-٢٠" ابن تغري بردي: س.پ، ج٦/ ل٢٢" العسلي: فن الحرب الاسلامي، مج٤/ ل١١٢.

محمـود) هـاتبووه کایـەوه، کاربەدەسـتان و لایەنـه بەرپرسەکانیشی لـه جێبـەجێ کردنـی بڕیاره نوێیـەکانی ئاگادار کـردەوه[٢٦]، وەك هەوڵدانێك بـۆ ئـەوەی ڕێـزی خـەڵکی دیمەشـق مـسۆگەر بکـات و لـەڕووی دەروونـی و مەعنەوییـەوه کاریگـەریان لێبکـات و کـار بـۆ حـوکمی نـوێ بکـەن کـه سەلاحەددین دەیبات بەڕێوه[٢٧]، لەبەر ئەوەی خۆی کەسێکی خودا پەرست بوو، هەروەها بۆ ئەوەی ڕەزامەندیان مسۆگەر بکات، هەوڵی ڕازیکردنـی زانـا ئایینیـەکانی دا، لەبـەر ئـەوەی زانـا ئایینیـەکان شـوێنێکی گـەورەیان لـه دڵـی خەڵکیدا هەبوو ئەم کـارەی کاریگـەرییێکی گـەورەی لەسـەر دەروونـی خـەڵکی بەجێهێشت[٢٨]، سـەلاحەددین سـەردانی مـاڵی داوەری داوەران (کمـال الـدین الشهرزوری)ی[٢٩] کـرد، چـووه ژوورەوەو سڵاوی خۆی لـه خـاوەن مـاڵ کـرد، هەرچـەنده خـراپ لەیـەکتر گەیـشتنێك لەنێوانیانداهـەبوو، کەچـی سەلاحەددین ئەمەی پشت گوێی خست، ئەمـەش بـۆ شـهرزوری بەتایبەتی بۆ دیمەشقیەکان بەگشتی مانـای ئەوپـەڕی نیـەت پـاکی و ڕەوشـت جـوانی هەبوو[٣٠].

---

٢٦ أبـن شـداد: س.پ، ل٥٧" النـويري: س.پ، ج٢٨/ ل٣٧٥" المقريـزي: السلوك، ج١/ ل١٦٨" ا.ر.جـب: س.پ، ل١٢٥.

٢٧ الرهاوي مجهول: س.پ، ل٢٠٧.

٢٨ أبـن شـداد: س.پ، ل١٤-١٥" أبـو شـامة: الروضـتين، ج١/ ل٢٣٦" ايليـسيف: س.پ، ل٤٤٨" زکـار: س.پ، ل٩٣.

٢٩ کمال الدين الشهرزوري: ناوی (محمـد بن عبدالله بن قاسم)ە، لـه سـاڵی (٤٩٢ك/١٠٩٨ز) لـەدایك بـووه، لەسـەردەمی (نـور الـدين محمـود)دا داوەری داوەران (قاضـي القـضاة)بـووه، واتـا لـەو کاتـەی سـەلاحەددين بەرپرسی پۆلیسی دیمەشق بوو، زۆرجار کێشه دروست دەبوو لەنێوانیان لەکاتی بەڕێوه بردنـی کاروبـاری دیمەشق، تاکو ساڵی (٥٧٠ك/١١٧٤ز) لـه دیمەشـق مایـەوه، پێش مردنـی سـاڵی (٥٧٢ك/١١٧٦ز) داوای لـه سەلاحـەددین کرد کـه (ضياء الدين)ی برای لـه شوێنی دامەزرێنێت، سوڵتان وەڵامـی داواکارییەکـەی دایـەوه، ئەمەش بەڵگەیـه لـه چاکی پەیوەندی نێوان هـەردووڵا. (أبـن الجـوزي: المنـتظم، ج١٠/ ل٢٦٨" أبـن واصـل: س.پ، ج٢/ ل٢٠" التكريتي: الايوبيون في شمال الشام والجزيرة، ل٧٧.

٣٠ أبن خلدون: تاريخ أبن خلدون، ج٥/ ل٢٥٥" أبن تغري بردي: س.پ، ج٦/ ل٧٣.

داوەری داوەران جوانترین پێشوازی لێکرد و پابەند بوونی خۆی بۆ ڕایگەیاند لە نێو کۆبوونەوەی ئامادە بوواندا ڕاگەیاندو وتی: "دڵنیابە بڕیار بڕیارتە، وڵات ووڵاتی خۆتە"[31]، ئەم وشانە ڕاگەیاندنێکی گشتی بوو بۆ دیمەشقییەکان بە پابەند بوونێکی ڕەها بۆ سوڵتان سەلاحەددین، ئەمەش ئەنجامی ئەو شێوازە بەهێز کراوە بوو کە بەرامبەر خەڵك و زاناکانی شام بەمەبەستی ڕاکێشان و یەکخستنی هێزەکانیان لەژێر ئالای خۆیدا بەکاری هێنا بۆ تێکۆشانی درێژخایەنی خۆی دژ بەخاچ دروشمەکان. هەر کاتێك سەلاحەددین دەچووە ناو قەلایەك یان شارێك لەو قەلاو شارانەی کەسەر بەیەکێك لەو میرە موسڵمانانەی لە سەنگەری دژ بە ئەودا بوون، ئەوە لێبوردنی گشتی بۆ خەڵکی ئەو شوێنانە ڕادەگەیاند، نموونەش لەسەر ئەو شارانەی لێبوردنیان بۆ دەرکراوە، شاری دیمەشق لە ساڵی (٥٧٠ك/١١٧٤ز)دا ئەو کارەی سەلاحەددین ڕێگەی بۆ ڕاکێشانی سەرنج و ڕێزی خەڵك خۆشکرد، لەهەمان کات بووە هاندەرێك بۆ خەڵکی ناو قەلاکەیان تا خۆ بەدەستەوە بدەن، لەبەر ئەوەی پێشتر لە پەیڕەو کردنی ئەو سیاسەتە دڵنیا بوون. بۆ نموونە خاوەنی هەردوو قەلای (حصن کیف)[32] و (الرها) ساڵی(٥٧٨ك/١١٨٢ز) بەم شێوەیە ملیان بۆ سەلاحەددین کەچکرد[33].

سەلاحەددین بەزۆری ئەم جۆرە جەنگە دەروونیەی بەکاردەهێنا، بۆ نمونە هەر قەلایەك یان شارێکی دەخستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە جگە لەیەك مەرج

---

٣١ أبن العماد: س.پ، ج٤/ ل٢٤٣" سعداوي: التاريخ الحربي، ل٥٩.

٣٢ حصن كيف: شارۆچکەو قەلاییەکی مەزنە، دەڕوانێتە سەر ڕووباری دیجلەلە نێوان ئامەد و جەزیرەی (ابن عمر) لە دیار بەکر. (یاقوت: س.پ، مج٢/ل١٥٣).

٣٣ أبو شامة: الروضتين، ج٢/ ل٣٢، أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل١٣٦" المقريزي: السلوك، ج١/ ل١٦٧-١٦٨.

هیچ مەرجێکی تری بەسەر خەڵکەکەیدا نەدەسەپاند، ئەو مەرجەش ئەو
بوو لەکاتی گرفت‌و ئاڵۆزیەکاندا، و دەبوایە سەربازەکانی شارەک
پشتگیری‌و هاوکاری سوپای سوڵتان بکەن، و لەهەمان کاتدا شارەکەشی ب
هەموو ئەو سەروەت‌و سامانەوە کە تیایەتی بۆ خەڵکەکەی بەجێ دەهێشت
نمونەش لەسەر ئەم کارانەی سەلاحەددین زۆرە، وەکو شاری (حلب) کە ل
ساڵی (٥٧٩ک/١١٨٣ز)دا خستیە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە و هیچ مەرجێکی
بەسەر ئەتابکی ئەو شارەدا کە (عماد الدين زنكی) [٣٤] بوو نەسەپاند [٣٥]، جگ
لە ناردنی ئەو سەربازانەی کە لەخزمەتی داگیرکەراندا بوون ب
(خۆپیشاندان‌و ئامادەبوون بەرامبەر داگیرکەر) [٣٦]، بێگومان ئەو شێواز
دەروونییە زۆر لە شارە موسڵمانەکانی ناچار کرد ملکەچی سەلاحەددی
بن‌و پەنا نەبەنە بەر جەنگ، لێبوردن بۆ هەرکەسێك بوو کە بەبێ شەڕ خۆ
بەدەستەوە بدایە، بەمەرجێك کە لەکاتی بوونی هەڕەشەی دەرەکید
سەربازەکان یەك بن‌و بەباشی هاوکاری بکەن وەك چۆن لە قەڵای (حص
کیف)دا ئەمە ڕوویدا. [٣٧]

پاش ئەو سەرکەوتنە مەزنەی سەلاحەددین لە شەڕی (حطين)دا بەدەستی
هێنا، هێزەکانی بەرەو پێش چوون بۆ بەندەری (عكا)، خەڵکەکە بەبێ شە
لە (جمادی یەکەمی ساڵی (٥٨٣ک/١١٨٧ز) خۆیان دایە دەس

---

٣٤ عماد الدين زنكی: ناوی (عماد الدين زنكی بن قطب الدين مودود بن عماد الدين زنكي) ناسراو بەخاوەنی شەنگار، لەپاش کۆچی دوایی (الملك الصالح اسماعيل) بوو بە والی (حلب)، سوڵتا سەلاحەددین لە ساڵی (٥٧٩ک/١١٨٣ز) گەمارۆی شاری (حلب)ی دا، پاش ماوەیەك عماد الدين زنك ناچار بوو شاری (حلب)ی دا بەدەستی سوڵتان سەلاحەددین بەرامبەر (شەنگار، نصيبين، خابور، الرقا سروج). (ابن خلكان: س.پ، ج٢/ ل٣٣٠-٣٣١" ابن تغري بردي: س.پ، ج٦/ ل١٤٤).

٣٥ ابن العديم: زبدة الحلب، ج٣/ ل٧٠" ابن شاهنشاه: مضمار الحقائق ل١٤٤-١٤٧.

٣٦ أبو شامة: الروضتين، ج٢/ ل٤٣.

٣٧ ه.س، ج٢/ ل٤٢.

سەلاحەددین، خاچ دروشمەکان بەرەو شاری (صور) هەڵهاتن، پاشان سەلاحەددین توانی دەست بەسەر قەلاو شارەکانی (تبنین[38]، صیدا، جبیل، بیروت) ی دەوری (عکا)شدا بگرێت، [39] بەم جۆرە خاچ دروشمەکان لەو شێوازە جەنگە درەوونیەی کە سەلاحەددین بۆ دەست بەسەراگرتنی شارو قەلاکان پەیڕەوی دەکرد، دەترسان.... یەکەم جار ڕووی دەکردە ئەو شارانەی دەکەوتنە کەنارەوە بۆ ئەوەی ڕێگە لە گەیشتنی هەر یارمەتیەك بگرێت وەکو لەهێرشی (بیت المقدس)دا ڕوویدا[40]، هاوکات ڕێگەشی بۆ گرتنی خۆش بکات، پاش ئەمە بەکەناردا بەرەو شاری عسقلان پێشڕەوی کرد و دوای (١٤) چواردە ڕۆژ گەمارۆدان دەستی بەسەردا گرت[41]، بە گرتنی شاری (عسقلان) سەلاحەددین گەمارۆی خستە سەر شاری قودس و کۆسپی خستە نێوان خاچ دروشمەکانو ئەو یارمەتیانەی کە لەکەناری دەریاوە بۆیان دەهات.

پاش خۆبەدەستەوەدانی (الرملة، الداروم، غزة، مشهد ابراهیم الخلیل، یبنی[42]، بیت لحم، بیت جبریل[43]، النطرون) ڕووی کردە قودس[44]، بێگومان سوڵتان سەلاحەددین لەچوارچێوەی ئامانجە دەروونیە بەهێز کراوەکەیدا، نیازی وابوو بە خراپە بەرەنگاری قودس نەبێتەوە و ئازاری پێنەگات، بۆیە

---

٣٨ تبنین: شارۆچکەیەکە لە چیاکانی (بنی عامر) دەڕوانێتە سەر شاری بانیاس لە نێوان دیمەشق و صور.(یاقوت:س.پ،مج١/ل٤٣١)

٣٩ أبن الاثیر: الکامل، مج٧/ ل٣٢٨-٣٣٠" النویري: س.پ، ج٢٨/ ل٤٠١.

٤٠ غنیم: س.پ، ل٣٨.

٤١ أبن الاثیر: الکامل، مج٧/ ل٣٣٢" أبن شداد: س.پ، ل٩١" عاشور: الحرکة الصلیبیة، ج٢/ ل٨١٩.

٤٢ یبنی: شارۆچکەیەکە لە نزیك (الرملة). (یاقوت: س.پ، مج٤/ ل٤٩٥).

٤٣ بیت جبریل: شارۆچکەیەکە لە نێوان (غەزەو بیت المقدس) هەروەها پێی دەوترێت بیت جبرین. (یاقوت: س.پ، مج١/ ل٤٠٨).

٤٤أبن الاثیر: الکامل، مج٧/ ل٣٣٢" النویري: س.پ. ج٢٨/ ل٤٠٢.

بۆ چوونە ناو شاری قودس ڕێگەی ڕێکەوتن نەك هێزی هەڵبژارد تاکو کاولکاری ڕوونەدات[٤٥]، و ئەتکی شوێنە پیرۆزەکان نەکرێت، بۆ ئەوەی لەدوای دەست بەسەرا گرتنی قودس دانیشتوانی شارەکە لەجێ بەجێ کردنی پرۆژەکانی هاوکارو یارمەتیدەری بن نەك دژی بن[٤٦].

بەڵام خاچ دروشمەکان گوێیان نەدایە، و خۆیان ئامادەی شەڕی مانو نەمان کرد، بەبێ ئەوەی تەماشای دوا ڕۆژ بکەن[٤٧]، شارەکە (٦٠) شەست هەزار سەربازی خاچی تێدا بوو، لێ بڕان کە تا کۆتایی تنۆکی خوێنیان شەڕ بکەنو بەرگری بکەن[٤٨].

سوڵتان سەلاحەددینیش، بڕیاری‌دا بەهەر نرخێك بێت ئەم کارە گرنگە تەواو بکاتو ئاڵای ئەیوبی لەسەر شاری قودس بەرزبکاتەوە[٤٩]، بۆ ماوەی (٥) پێنج ڕۆژ تیپی سەرانسۆ کردنی نارد، بۆ ئەوەی شوێنە لاوازەکانی هێزی دوژمن دەست نیشان بکەن[٥٠]، سەلاحەددین توانی یەکێك لەو ڕێسایانە جێبەجێ بکات کە ئەمڕۆ لە جەنگی نوێدا جێبەجێ دەکرێت، بۆیە لەهەر چوار لاوە ئابلۆقەی داو مەنجەنیقی ئاگر پرژێنی لێ خستە کارو تەنگی پێ هەڵچنین... وای لێکردن ئاوات بەمەرگی خۆیان بخوازن[٥١].

هەروەها ڕازی کردنی خاچ دروشمە شکست خواردوەکان بەوەی ئەم

---

٤٥ أبن الاثیر: الکامل، مج٧/ ل٣٣٢"رفعت: س.پ، ل١٦٨.

٤٦ أبن الاثیر: الکامل، مج٧/ ل٣٣٥.

٤٧ دشسنر: احفاد صلاح الدین الایوبي، ل٨٢"غنیم: س.پ، ل٤٠.

٤٨ أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل٢١٢-٢١٤.

٤٩ أبن الاثیر: الکامل، مج٧/ ل ٣٣٣" أبن شداد: س.پ، ل٩١" أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل٢١١-٢١٧" النویري: س.پ، ج٢٨/ ل٤٠٥.

٥٠ أبن الاثیر: الکامل، مج٧/ ل٣٣٣" أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل٢١٢" النویري: س.پ، ج٢٨/ ل٤٠٣" ابن العبري: س.پ،ل٣٨٤.

٥١ العماد الکاتب: الفتح القسي، ل١٢٥" أبن الاثیر: الکامل، مج٧/ ل٣٣٣" أبن شداد: س.پ، ل٩٢.

شکسته شکستێکی یەکجارەکیە، ئەویش لە ڕێگای ترس و تۆقاندن یان بەزۆر ڕازیکردن، و بەرژەوەندیان لەوەدایە دان بەم دۆڕاندنە بنێن و هەماهەنگی لایەنی سەرکەوتووبن[52].

یەکێك لە هۆکارەکانی سەرکەوتنی ئەم جۆرە جەنگە، دروست کردنی گیانی خۆ بەکەم زانینە لەلای دوژمن، کە ئەمەش دەبێتە هۆی کەم بەرەنگار بوونەوەیان[53]. بەم شێوەیە مەدەنیەکان لە دوای داگیرکردنی شارەکەیان دەکەونە ژێر کاریگەری ئەم هەنگاوە، بە شێوەیەك وایان لێدێت کە ناتوانن هیچ کارێکی تێکدەرانە ئەنجام بدەن یان ببنە کۆسپ لە پێش داگیرکردنیان[54].

دەرگاکانی شار لە ڕووی سوپای ئەیوبیدا کرانەوە و سوپاکە بە شادی و سەربەرزیەوە چووە ناو شار و لەپێش هەموو شتێکدا چوون ئەو خاچە ئاڵتونیە زەبەلاحەیان ووردوخاش کرد کە لەسەر گومەزە بەردینەکە (قبة الصخرة) قۆچیان کردبوونەوە، و ئالای ئەیوبیان لەسەر شارەکە بەرز کردەوە[55]، بەم شێوەیە سوڵتان سەلاحەددین توانی ئامانجی گەورەی خۆی و موسڵمانان بەدیبهێنێت، ئەویش (کارکردن بوو بۆ ڕزگار کردنی قودس) کە پێشتر باسمان لێوە کرد، بەڕێگای جەنگی دەروونی ستراتیژی و تاکتیکی بوو، سوڵتان لەئەنجامی ئەو کار و هەوڵانەوە سەرکەوتنەکەی کردە واقیعێکی سەپێندراو بەهۆی جەنگی دەروونی بەهێزکراو توانی بۆ

---

٥٢ السيد: س.پ، ل٦٧.

٥٣ السلسلة المرقمة ٢٩: الحرب النفسية، ل٩.

٥٤ عبدالله: س.پ، ل١٩.

٥٥ أبن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٣٣٦" ابن شداد: س.پ، ل٩٢-٩٣" النويري: س.پ، ج٢٨/ ل٤٠٥" زكار: س.پ، ل١٤٩-١٥٠.

ناوجەرگەی دانیشتوانی شاری قودس ئاراستەی بکات و توانی ئەو سەرکەوتنە گەورەیە ئەنجام بدات.

دوای ڕزگارکردنی قودس، سەلاحەددین سەربازەکانی لەگەڕەك و شوێنە جیا جیاکانی ناوشار بڵاوکردەوە بۆ پاراستنی ئەمن و ئاسایش و ڕێگرتن لەدزی و ئاژاوە گێڕی[٥٦]، بەم شێوەیە ورەی موسڵمانەکان بەرز ببوەوە و بەڵام خاچ دروشمەکان کەوتنە کارتێکردنی هەرەس و شۆکەوە (الصدمە)، بەجۆرێك نەیانتوانی کردارێکی ئاژاوە گێڕی یان تەگەرەیەك بۆ پرۆسەی داگیرکردنەوە یان ڕزگارکردنەوەی شارەکە لەلایەن سەلاحەددین دروست بکەن[٥٧]، سوڵتان سەلاحەددین پاش ئەوە فەرمان و ئامۆژگاری بۆ ڕێکخستنی پرۆسەی کۆکردنەوەی (فدیە- ڕزگارانە) لە خاچ دروشمەکان دەرکرد[٥٨]، پیاوەتی و لێبوردن و بەزەیی و میهرەبانیەکی زۆری بەرامبەر خاچ دروشمەکان پیشاندا بەمەبەستی بەدەستهێنانی زۆرترین ڕیژەی پێویست لە هاوکاری خەڵکی لەگەڵ ئەیوبیەکاندا[٥٩].

سوڵتان سەلاحەدین دوای ئەوەی سوپای دۆڕاوی لەناودا بە زوویی فەرمانی دەرکرد بۆ پێکهێنانی تیپێك بۆ بنیادنانەوەو ئاوەدان کردنەوە وەك بەشدارییەك لە کەرتی خزمەتگوزاری بۆ دانیشتوان و بانگەشە کردن بۆ چەند کارێك لە داهاتوودا بۆ سەرلەنوێ گێڕانەوەی و بنیادنانەوەی بۆ دۆخی جاران، پاش ئەوەی فەرمانی دەرکرد بۆ پاککردنەوەی بەردەکەی (بیت المقدس)، (قورئانەکانی) گواستەوە بۆ ئەوێ و خوێنەری بۆ

---

٥٦ أبن الاثیر: الکامل، مج٧/ ل٣٣٥" عبدالقادر: القدس، ل٥٨.

٥٧ العماد الکاتب: الفتح القسي، ل٣٧.

٥٨ النویري: س.پ، ج٢٨/ ل٤٠٤" المقریزي: السلوك، ج١/ ل٢١٠" ابن تغري بردي: س.پ، ج٦/ ل٣٤" العلیمي: س.پ، ج١٠/ ل٣٢٩.

٥٩ گروسیە: س.پ، ل٧٥.

ڕێکخستن[٦٠]. لەوێوە لەناو شاری قودسەوە سوڵتان سەلاحەددین توانی جەنگێکی دەروونی ئاراستە بکات کاتێك فەرمانی دەرکرد کە دەرگاکانی کڵێسەی (القیامە)[٦١] دابخات، ڕێگەی لە خاچ دروشمەکان گرت کە وەك مەنزەڵگایەك سەردانی بکەن[٦٢]، مەبەستیش ئەوە بوو ڕازی بن چی بەڕازی بوون بێت یان ترساندن کە شکستەکەیان شکستێکی یەکجارییەو لە پاشیشدا هەست بەکەمی بکەن ورەیان بڕوخێتو ڕووبەڕوو بوونەوەیان بۆ سەلاحەددین لاواز بێت.

پاش ئەوە سوڵتان فەرمانی دەرکرد کە هەندێ دەزگای وەك (بیمارستانو خانەقا[٦٣]) دامەزرێنن، هەروەها خوێندنگەی (الصلاحیە)ی بۆ خوێندنی فیقهی شافعی لە کڵێسەی (القیامە)، و شورای شاری سەر لەنوێ چاککردەوەو هەندێ بورجو سەنگەری بۆ زیاد کرد، و گۆڕستانی دەرگای (الساهرە)ی کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی (بیت المقدس)و گومەزی (یوسف) کە دەکەوێتە باشووری (فناء الصخرة–حەوشە بەردینەکە)و مزگەوتی شاخی توور (الطور)[٦٤]ی چاککرد.[٦٥]

---

٦٠ أبن الاثیر: الکامل، مج٧/ ل٣٣٦" النویري: س.پ، ج٢٨/ ل٤٠٥.

٦١ قیامە یان قمامە: مەزنترین کڵێسەی خاچ دروشمەکان بوو لە (بیت المقدس)، دەکەوێتە ناوەڕاستی شارەکە، گۆڕستانێکی ئێیە پێی دەڵێن (القیامە)، چونکە پێیان وایە کە (مەسیح) قیامەتی لەوێ هەستاوە، بەڵام ڕاستی ناوەکە قیامە نییە بەڵکو قەمامەیە، چونکە زبڵخانەی دانیشتوانی شارەکە بوو، هەروەها لەسەر شورای شارەکە دەستی خراپە کارانیان دەبڕی و دزەکانیان تێدا لەخاچ دەدا، بەڵام کاتێك مەسیح لەخاچ درا (واتا ئەو کەسەی کە شێوەی لە مەسیح دەچوو) لەوکاتەوە ئەو شوێنە پیرۆز بوو لایان). ( ناصر خسرو: س.پ، ل٧٤–٧٥"یاقوت: س.پ، مج٤/ ل٤٤).

٦٢ العماد الکاتب: الفتح القسي، ل١٤٥" المقریزي: السلوك، ج١/ ل٢١١.

٦٣ خانەقا: وشەیەکی فارسییە لە بنچینەدا وتراوە (خونکاه) واتا ئە و شوێنەی پادشا نانی تیائەخوات، وە گۆشەی دەروێشەکان بووە. (المقریزي: الخطط، ج٤/ل٢٧١).

٦٤ طور: دێیەکە لە باشووری خۆرئاوای قودس، و ناوی چیایەکە لە (سیناء). (العماد الکاتب: الفتح القسي، ل٥٤).

٦٥ أبن الاثیر: الکامل، مج٧/ ل٢٠٧" ابن شداد : س.پ، ل١٢٩" ابن واصل: س.پ، ج٢/ ل٢١٧.

بـەم جـۆرە دەبيـنين سـەلاحەددين پـاش ڕزگـاركردنی شـاری قـودس كاروبـاری ئەو شـارەی ڕێكخست و لەچوارچێوەی ئامانجـە دەرونيەكانيـدا هەنـدێ دامو دەزگـای گرنگـی تيـا دامەزراند، دڵنيـابوونو ئەمانو پـاكی بـۆ گێڕايەوە و حاڵەتی عەقڵی لا خولڵقاندن كە ناتوانن هيچ كارێكی تێكدان يان ڕێگرييەك بۆ كارەكانی سەلاحەددين لەشاری قودسدا ئەنجام بدەن[٦٦].

---

٦٦ أبن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٣٢٧" حسن: س.پ، ج٤/ ل١٠٧" العسلي: صلاح الدين الايوبي، ل١٧٠.

## باسی دووەم: جەنگی دەروونی بەرگری
## Defensive

دەبێ جەنگی دەروونی بەرگری لەسەر شێوازێکی هونەری بنیاد بنرێت، و مەبەستەی سەرکەوتوو بێت لەبەرەنگار بوونەوەی دوژمن و هەوڵدان بۆ ستنەوەی دووبەرەکی لەنێو ڕیزەکانی دوژمن و بڵاوکردنەوەی گیانی ڕاندن و شکستو ڕووخاندنی ورە[٦٧]، ئەم جەنگە هەموو هەوڵەکانی ڕاستەی دوژمنەکانی دەکات بەمەبەستی ڕووخاندنی ورەیان، ئەویش باتر ئاڕاستەی بیری سەربازەکان دەکرێ بۆ خۆبەدەستەوە دانیانو هڵنەستانیان بەهیچ چالاکییەك بۆ ئەو بەرەیەی بۆی دەجەنگن، سەرەڕای مانەش هەوڵدان بۆ بەگژا چونی دوژمن لەنێوان خۆیان و هەوڵ دان بۆ وخاندنی ورەو دامرکاندنی هیممەتی سەربازو سەرکردەکانیان[٦٨].

دوای ئەوەی سەلاحەددین وەزارەتی مصری گرتە دەست، خاچ روشمەکان زۆریان بەلاوە ناخۆش بوو، چونکە ئەترسان لەهەموو لایەکەوە وسڵمانەکان ڕوو بکەنە ئەو، و هەوڵی ڕزگارکردنی قودسو ناوچەکانی تر دەن، بۆیە چاویان بڕیبووە هەموو جوڵانەوەیەکی بۆ ئەوەی لەهەلێکدا ەلاماری بدەنو لەناوی بەرن[٦٩].

بۆ ئەوەی جەنگی دەروونی بەرگری کاریگەریەکی بەهێزی هەبێت، ێویستە لایەنی بەکارهێنەری ئەو کارانەی کە بۆ ڕووخاندنی ورەی ەرامبەر ئەنجامیان دەدات کاریگەرو جەرگبڕ بن.

---

٦ الرضا: س.پ، ل٢٠٥.

٦ نصر: س.پ، ج/١ ل٢٤٥.

٦ بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: عاشور: الحركة الصليبية، ج٢/ ل.٧٠٥-٧١٠.

بۆ نمونه له ساڵی (٥٦٩ك/١١٧٧ز) خاچ دروشمەکانی (صقلیه) پەلاماری ئەسکەندەرییەیان دا هەرچەندە پادشای (صقلیه) ئاگادار نەبوو لە مصر چی ڕوویداوە کەچی پیلانەکەیان ئاشکرا بوو[70]، بۆیە کەشتی گەلیەکەی خۆی ئامادە کرد کەپێکهاتبوو لە (٢٠٠) دوو سەد (شینی) و (٣٦) سی و شەش (طریدە)[71] و (٦) شەش کەشتی گەورەش ئامرازی شەڕیان هەڵگرتبوو، بەهەزاران سەربازی پیادەو سوار لە خاچ دروشمەکان بەسەرکردایەتی ئامۆزای (الکسیوس کونتنغانوس) پادشای (صقلیه) گەیشتنە ئەسکەندەرییە[72].

لێرەوە شێوازی دانایی سەلاحەددین لەبەرگریکردن لە شاری ئەسکەندەرییەدا لەچوارچێوەی ئامانجی دەروونی بەرگری و هەوڵدان بۆ بەرگری کردن لە شوێنە ئیسلامیەکانی ناوچەکە کە نزیکن لە ئەسکەندەریەوە دەردەکەوێت، لەکاتێك سەلاحەددین و سەربازانی لە (فاقوس) دابەزیبوون، دوای (٣) سێ ڕۆژ لە گەمارۆدانی ئەسکەندەریە لە لایەن خاچ دروشمەکانەوە هەواڵەکەی پێگەیشت. سوڵتان مەملوکێکی[73] بۆ لای بەرگریکەران و دانیشتوانی شاری ئەسکەندەرییە نارد، تاکو لە هاتنی سەلاحەددین بۆ یارییدەدانیان ئاگاداریان بکاتەوە، دانیشتووان و

---

٧٠ شاکر: س.پ، ج٦/ ل٣٢١" العسلي: صلاح الدين الايوبي، ل١١٤-١١٥" غنيم: س.پ، ل٢٤" بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی ئەو پیلانە بڕوانە بەشی دووەمی ئەم توێژینەوە.

٧١ طریدة: کەشتیەکی قەبارە گەورەی بار هەڵگربوو، تایبەت بوو بە هەڵگرتنی ئەسپ، کە توانای هەڵگرتنی (٤٠)ئەسپی هەبوو.( ابن مماتی: س.پ، ل٣٣٩" حسین: س.پ، ل٣٤١)

٧٢ الصوري: س.پ، ج٤/ ل١١٧" أبن شداد: س.پ، ل٥٥-٥٦" النويري: س.پ، ج٢٨/ ل٣٩٢" ابن خلدون: تاريخ أبن خلدون، ج٥/ ل٢٨٨، " رنسيمان: س.پ، ج٢/ ل٦٥٠.

٧٣ مەملوك -مەمالیك: بریتی بوون لەو تورك و چەرکەس و ئەو کۆیلانەی کە ئەیوبیەکان لەشەڕو کاری سەربازیدا بەکاریان دەهێنا، دواتر هەندێك لەسەرکردەکانیان جڵەوی دەسەلاتیان گرتە دەست و لە مصردا دوو بنەماڵەی مەمالیك (بحری و بورجی)یان دامەزراند. (العبادي: قيام دولة المماليك الاولى في مصر و الشام، ل٨٥-٨٨)

ەرگریکـەران ئازایانـە بـەرگریان لەشـارو ولآت کـرد[٧٤]، سـەلآحەددین
ڕاستەوخۆ بەلەشکرەکەیەوە ڕۆیشتە سەریان و لـەڕۆژی چوارەمدا تـاوەکو
ەسر شەڕ بەردەوام بوو، بێگومان بلآوبوونەوەی هەواڵی هـاتنی سوڵتان
سـەلآحەددین و فەرمانـدەکان بـۆ ئەسـکەندەرییە کاریگەریـەکی گـەورەی
ەروونـی لەسـەر بـەرگریان هـەبوو ودانیـشتوانی شـاری ئەسـکەندەریە
ـەخۆڕاگرتن و بـەرگری کردنـدا[٧٥]، ئەمـە لەلایـەك لەلایـەکی تریـشەوە کاتێـك
ـاچ دروشمـەکان هـەواڵی پێشڕەوی سـەلآحەددینیان بیـست بـووە هـۆی
ووخانـدنی ورەیـان و شکـستهێنانی هێرشـەکەیان[٧٦]، بەمـەش شـێوازی
ەروونی سەلآحەددین سەرکەوتوو بوو، چونکە بەرگریکەرانی دانیشتوانی
شاری ئەسکەندەرییە بەشێوەیەك ورەیان بەرز ببوەوە،

هـەموو مانـدوێتی و ئازارێکیـان لـەیاد کـرد، هۆکـارە دەروونیـەکان زۆر
کاریگـەر بـوون، بەشـێوەیەك هەریـەکێك لەبەرگریکـەران وای دەزانـی
سەلآحەددین لەگەڵیدایـە، وا شەڕی دەکرد وەکو بڵێی سەلآحەددین چاوی
لێیـەتی[٧٧]، هاوکـات یـەکێك لەبەرگریکـەران بـەنهێنی لـەدەرگای شـار چـووە
دەرەوە و هێرشی کردە سەر ئامێرەکانی گەمارۆدانی دوژمن[٧٨]، پێش دوایی
هاتنی ئەو شـەوە، سوپای سـەلآحەددین دووبـارە بۆ شـەڕکردن دەرچوون و
ترسیـان بـردە دڵ و دەروونیـان، بەشـێوەیەك ئـەوانی خـستە نـاو ئـاگرێکی
سووتێنەرو هەندێ لە کەشتیەکانیشی نوقمی ژێر ئاوو کردن و ژمارەیەکی

---

٧٤ أبن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٢٤٩" النويري: س.پ، ج٢٨/ ل٣٩٢.

٧٥ أبـن شـداد: س.پ، ل٥٦" أبـن خلـدون: تـاريخ أبـن خلـدون، ج٥/ ل٢٨٨" أيليـسيف: س.پ، ل٤٤٧" العسلي: صلاح الدين الايوبى، ل١٩٢" ماهر: تاريخ البحرية في مصر الاسلامية، ل١٠٢.

٧٦ أبن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٢٥٠" النويري: س.پ، ج٢٨/ ل٣٩٣.

٧٧ أبن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٢٥٠.

٧٨ أبو شامة: الروضتين، ج١/ ل٢٣٥" أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل١٥" العريني: الشرق الادنى في العصور الوسطى، ل٤٨.

زۆریــشی لێکوشــتن، ئەوانــەی دەربازیـــان بــوو ڕایــان کــرد، هەرچـــی جبەخانەیـــەکیان هـــەبوو هـــەموو کەوتنـــە ژێردەســـتی موســـڵمانەکان و بـــەخراپترین شـــێوە تێـــك‌وپێکی شـــکاندن، و هەڵمـــەتی خـــاچ دروشمـــەکانی پەرتـــەوازە کـــرد، ئەوەشـــی مـــابووەوە بەوورەیـــەکی ڕووخـــاوەوە لـــە ســـاڵی (٥٧٠ك/١١٧٤ز)دا بەرەو (صقليه) هەڵهاتن[٧٩].

بەم شێوەیە ئەم هەڵمەتە بە شکستێکی گەورەی خاچ دروشمەکان کۆتایی هات، هاوکات پایەو دەسەلاتی سەلاحەددین لە ئەسکەندەریە بەتایبەتی و لە مصر بەگشتی جێگیر بوو، چونکە یەکەم ڕووبەڕووبوونەوەی ڕاستەقینە بوو بۆ هێزەکانی سەلاحەددین بۆ پتەو کردنی شورای کەنارەکانی مصر لە مەترسی هەر هێرشێکی خاچ دروشمەکان لەڕێگای دەریاوە بیکەن.

تێڕوانین‌و پیلانـەکانی سـەلاحەددین لـە چوارچـێوەی جـەنگی دەروونـی بەرگریدا لەجێگای خۆیدا بوو بە تایبەتی لە پێشبینی کردنی هێرشـی خـاچ دروشمەکانـدا، بـۆ نمونـە سـوڵتان سـەلاحەددین ئاگـادار بـوو لـە هـاتنی (ریچاردی شێردڵ)، و سوور بوونی لەسەر گەمارۆدانی شـاری قـودس، بۆیـە بڕیاریدا بەرەو قودس بڕوات، تاوەکو پێش وەخت سەنگەرو قایمکاریـەکانی پتەو بکات و کاروباری شار ڕێك بخات بۆ بـەرگری لێکردنـی و پاراسـتنی لـە چوارچـــێوەی ئامـــانجی دەروونـــی بەرگریـــدا، ســـەلاحەددین لـــەکاتی سەرانـــسۆکردنی هـــەواڵی خـــاچ دروشمـــەکان ئاگـــادار بـــوون لەهـــەموو جموجۆڵێکیـان لەدەوروبـەری قودسـدا پـشتی بـە تیپـی (یـزك) دەبەسـت[٨٠]، هاوکـات سـوڵتان فەرمانیـدا بەهەڵکەنـدنی سـەنگەرێك بـەدەوری شـاردا،

---

٧٩ الصوري: س.پ، ج٤/ ل١٧٧" العماد الكاتب: البرق الشامي، ج٣/ ل١٧٣-١٧٤" أبن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٢٥٠" ابو شامة: الروضتين، ج١/ ل٢٣٥" أبن واصل: س.پ، ج١/ ل١٦" النويري: س.پ.ج٢٨/ ل٣٩٣" المقريزي: السلوك، ج١/ ل١٦٥.

٨٠ أبن شداد: س.پ، ل٢٧٨.

هەروەها سوپاکەی بۆ بەرگری شورای قودس بەسەر فەرماندەکانیدا، دابەش کردو کەرەستەی گەمارۆدانی شوێنی بەرگریکردنی پێدان، ئەمەو جگە لەو شێوازانەی پیادەی کرد، دەست بەجێ هەستا بە تێکدانی بیرو کانیاوەکانی دەوروبەری شاری قودس بەشێوەیەك هیچ یەکێك لەو ئاوانەی کە بۆ خواردنەوە بشێت نەمان[٨١]. هەروەها لەچوارچێوەی شێوازە دەروونییە بەرگرییەکانی کە لەدژی خاچ دروشمەکان پیادەی کرد، هەڵسا بەبەرزکردنەوەی گیانی ورەی سەربازەکانی بەهاندانیان بۆ بەرگریکردن لەشاری قودس لە دژی (ریچاردی شێردڵ)، ئەوە بوو سوڵتان فەرمانیدا بە کۆبوونەوەی ئەنجومەنە جەنگیەکەی لە شەوی (هەینی ١٩ی جمادی الاخرە ساڵی ٥٨٨ك/١١٩٢ز) بەمەبەستی گوێگرتن لەڕاو بۆچوونیان، هەرچەندە یەکەم ڕۆژ هەموو بەبەرگری کردن لە قودس ڕازی بوون، بەڵام ڕۆژی دواتر زۆربەیان لە هەڵوێستەکەیان پەشیمان بوونەوە، چونکە ترسی (ریچارد) چووبووە دڵ و دەروونیان -بەتایبەتی- لە داوی ڕووداوی (عکا)[٨٢]، کە کاریگەری دەروونی خراپی لەسەر ورەی موسڵمانان بەجێ هێشتبوو، هاوکات (ڕیچارد) لەم ڕووداوانەی نێو سەرکردایەتی سەلاحەددین بێ ئاگا بوو، هەروەها سوڵتان سەلاحەددینیش سەرەتا بێ ئاگا بوو لە ڕووداوەکانی

---

٨١ أبن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٣٩٠" أبن شداد: س.پ، ل٢٨٣" ابو شامة: الروضتين، ج٢/ ل١٩٨" أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل٣٨٥.

٨٢ ئەوەبوو خاچ دروشمەکان بۆ ماوەی دوو ساڵ گەمارۆی شاری عکایان دا لە نێوان سالانی(٥٨٥-٥٨٧ك/١١٨٩-١١٩١ز) و هێزە موسولمانەکان بە سەرکردایەتی سولتان سەلاحەددین چەند جارێك لە دەرەوەی شاری عکا هەولی رزگارکردنی دانیشتوانیان دا، بەلام هەولەکانیان بێئاکام بوو. بەمەش (المشطوب الهكاري) ( فەرماندەی هێزی ئەیوبیەکان بوو لەشاری عکا)، ناچار بوو بکەوێتە گفتو گۆ لەگەل خاچ دروشمەکاندا بۆ خۆبەدەستەوەدانی شارەکە، بەلام ریچارد لەکاتی دەرچوونی بۆ ناو شارەکە فەرمانی کوشتنی دیلە موسولمانەکانی دا کە ژمارەیان نزیکەی (٣٠٠٠) کەس دەبوو، (پێمان وایە ئەم ژمارەیە زێدەڕۆیی تێدایە).( أبن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٣٨٦-٣٨٧" أبن شداد: س.پ، ل٢١٦-٢١٧" ابن كثير: س.پ، ج١٢/ ل٤١٢).

**ناو سەرکردايەتی خاچ دروشمەکان، بەڵام پاشان سيخوڕەکان هەواڵی مژدە بەخشيان دەربارەی تێکچوونی پەيوەندی نێوان خاچ دروشمەکان بۆ هێنا[83]، تا هەڵوێستی دەروونی بۆ وەربگرن[84]، بەم جۆرە قايم کاريەکانی سەلاحەددين و نەخشەکانی بۆ بەرگريکردن لە قودس لە زستانی ئەو ساڵەدا کارێکی باشی کردە سەر خۆڕاگری شارەکە، بەتايبەتيش کاتێك کە سەربازەکانی مصر بە فەرمانەدەيی مير (ابو الهيجاء السمين)[85] گەيشتنە ئەوێ[86]، جگە لەو شێوازانەی کە سوڵتان سەلاحەددين پيادەی کردن، لە ڕۆژی دووەمدا هەواڵی مژدە بەخشی پێگەيشت کەوا خاچ دروشمەکان لەنێو خۆياندا تێك چوونەو لەو شوێنەدا نەماون[87]، بەتايبەتی دوای ئەوەی سيخوڕەکانيان لەژەهراويکردنی**

**بيرو کانياوەکانی ناوچەکە بەدەستی سەربازانی سەلاحەددين ئاگادار کردبوونەوە، و لايان ئاشکرا بوو کە بەهيچ شێوەيەك سوپای هێرشبەر ئاوی خواردنەوەی دەست ناکەوێت و کارەساتی (حطين) دووبارە دەبێتەوە، چونکە خاکەکەی دەوروبەری قودس بەردينەو زۆر ڕەقە و بەئاسانی بيری تێدا هەڵناکەنرێ[88]، بێگومان ژەهراو يکردن و تێکدانی بيرەکانی ناوچەکە،**

---

٨٣ العماد الكاتب: الفتح القسي، ل٥٩٨" أبن شداد: س.پ، ل٢٨٦" ابو شامة: الروضتين، ج٢/ ل٢٠٠" أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل٣٩٣" المقريزي: السلوك، ج١/ ل٢٢٣" حسين: س.پ، ل٤٨٦-٤٨٧.

٨٤ أبن الفرات: س.پ، م٤ ج٢/ ل٦٨-٦٩" نوري: سياسة صلاح الدين، ل٣٥٠" حسين: س.پ، ل٤٨٣.

٨٥ ابو الهيجاء السمين: ناوی (حسام الدين)، يەکێکە لە ميرە کوردەکانی سەردەمی سوڵتان سەلاحەددين، هاوکات لە فەرماندە بەناوبانگەکانی بوو، والی شاری (نصيبين) بوو فەرماندەی سوپای مصری بوو لەيەکێك لەهەڵمەتەکانی خاچ دروشمەکان، هەروەها فەرماندەی سوپای خەليفەی عەباسی (الناصر لدين الله) بوو لەکاتی هەڵمەتيان بۆ سەر هەمەدان، لە گەڕانەوەيان لە شاری (داقوقا) کۆچی دوايی کردو هەرلەوێش نێژرا. (ابن تغري بردي: س.پ، ج٦/ ل١٤٥" زکي: مشاهير الكرد وكردستان، ج١/ ل٨٢).

٨٦ أبن شداد: س.پ، ل٢٨٤.

٨٧ أبن شداد: س.پ، ل٢٨٧" ابن كثير: س.پ، ج١٢/ ل٤٥٧-٤٥٨.

٨٨ أبن شداد: س.پ، ل٢٨٧" ابو شامة: الروضتين، ج٢/ ل١٩٩.

پلانێکی دەروونی بەرگری سەرکەوتوو بوو لەچوارچێوەی شێوازی جەنگە دەروونیەکانی سەلاحەددیندا، کە ئامانجێکی باشی بەدەست هێنا، ئەمە جگە لەوەی کە (ریچارد) خۆی هۆکار بوو لە رووخانی ورەی خاچ درۆشمەکاندا کاتێک داوای کرد وێنەی قودس و وەسفی شارەکەی پێشکەش بکەن، ئەوانیش بۆیان وێنە کێشا، پاش تێبینیکردنی وتی: "تاکو سەلاحەددین زیندوو بێت و موسڵمانان یەکگرتوو بن ئەم شارە ناگیرێت، هاوکات توانای گەمارۆدانی قودسیشمان نیە، چونکە لەشارەکەدا رووبەرووی هێزەکانی سەلاحەددین دەبینەوە"[89].

هاوکات لەگەڵ تێکچوونی پەیوەندی نێوان فەرەنسیەکان و ئینگلیزەکان کە پێشتر باسمان لێوە کرد،[90] کە لەئەنجامدا تووشی دڵە راوکێ و بارێکی دەروونی ترسناک بوون، بۆیە دەکرێ بگوترێت کە جەنگی دەروونی هۆی سەرکەوتنی سەلاحەددین و شکست و کەوتنی خاچ درۆشمەکان بوو.

---

٨٩ ابن الاثیر: الکامل، مج٧/ ل٣٩١.

٩٠ بۆ زیاتر زانیاری بروانە بەشی سێیەمی ئەم توێژینە وەیە، لاپەرە(  ).

## باسی سێیەم: جەنگی دەروونی هێرشبەر
## Offensive

لەوانەیە جەنگی دەروونی هێرشبەری جیاوازی نەبێت لەگەڵ شەڕی سەربازی لە ڕووی ئامادە کردنی پلانی داڕێژراو، دەشێت جەنگی دەروونی هێرش بکات لەوەیە لەباری بەرگریدا بێت، لەوەیە لەلایەکەوە بکشێتەوە و لەلایەکی تر هێرش بکات. ئەمەش کتو مت وەکو جەنگی سەربازی وایە[٩١]. لەشێوازە دەروونیە هێرشبەرەکانی سوڵتان سەلاحەددین گەڕانو سەرانسۆ کردن (استطلاع) و کۆکردنەوەی زانیاری بوو لەسەر دوژمن پێش ڕوودانی شەڕ، سەلاحەددین ئەم بنەمایەی بەکاردەهێنا کە بەگرنگترین بنەمای جەنگ دادەنرێت لای ئەیوبیەکان[٩٢]، چونکە گەڕانو سەرانسۆیو کۆکردنەوەی زانیاری و چاندنی سیخوڕ لەنێو دوژمندا پێویستیەکی گرنگە، کە دەبێ هەموو سەرکردەیەکی سەربازی پیادەی بکات، بۆ ئەوەی شارەزایی خواستی مەبەستەکانی دوژمن بێت و لەو ڕێگەیەوە چەندین زانیاری پێویستی دەست بکەوێ بۆ سەرخستنی پلانی دەروونی هێرش بەر[٩٣]، لە ڕووداوە مێژووییەکان کە زۆر ڕاشکاوانە باس لە ڕۆڵی سیخوڕی دەکات لە ئاڕاستە کردنی جەنگی دەروونی هێرشبەردا و هێنانی زانیاری بۆ سەلاحەددین و ئاگادارکردنەوەی لە نیازو جموجوڵی خاچ دروشمەکان، ساڵی (٥٧٤ك/١١٧٨ز) کاتێك خاچ دروشمەکان بە فەرماندەیی (هنفری) هێزەکانیان کۆکردەوە[٩٤]، سیخوڕەکان بەخێرایی ئەم زانیاریانەیان گەیاندە

٩١ مخيمر: المدخل الى علم النفس الاجتماعي، ل٢٨٢.
٩٢ امين: الاستخبارات الايوبية، ل١٣٩.
٩٣ نوفل: س.پ، ل١١٠.
٩٤ المقريزي: السلوك، ج١/ ل١٧٧" عاشور: الحركة الصليبية، ج٢/ ل٧٦٠.

سەرکردایەتی ئەیوبی، بەنیازی ئەوەی کە هێرشی کتو پڕ لە وڵاتی شام بکەنە سەر ئەیوبییەکان[٩٥]، سەلاحەددین بە فەرماندەیی (عزالدین فرخشاه)ی برازای هێزێکی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیان لەناو ئەو سەربازگەیەی کە تێیدا کۆبوونەتەوە ئامادە کرد، بەمەبەستی ئیفلیجکردنی ورەیان‌و شکست هێنان بە تواناکانیان لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی دەنگۆ لەناو ڕیزەکانیاندا، شەڕێکی بەهێز لەنێوانیاندا بەرپا بوو، سەلاحەددین سەرکەوتنی بەدەستهێنا[٩٦]، جگە لەوە سوودی لە دەستگیر کردنی هەندێ دیلی خاچ دروشمەکان‌و شوان‌و جوتیارانی ناوچەکەو وردەواڵە فرۆشەکان کە بەشوێن‌و سەربازگەی خاچ دروشمەکاندا دەسوڕانەوە وەرگرت،[٩٧] بەم شێوەیە سەلاحەددین شارەزایی سیستەمی سیخوڕی جەنگی بە واتا نوێیەکەی بوو، گرنگی ئەو زانیاریانە کە سیخوڕەکان سەلاحەددینیان لێ ئاگادار دەرکردەوە، لە میانەی ڕووداوەکانی (مرج العیون)[٩٨] ساڵی (٥٧٥ك/١١٧٩ز) دەرکەوت، کە سوپای ئەیوبی بە سەرکردایەتی سەلاحەددین بەسەر سوپای خاچ دروشمەکاندا بە سەرکردایەتی پادشا (بلدوینی چوارەم) سەرکەوتنی بەدەستهێنا[٩٩]، لەکاتێکدا سەلاحەددین لە بنکەی سەربازی خۆیدا بوو لەتەنیشت (تل القاضي)[١٠٠] یەوە هەندێك لە شوانەکان هاتنە لای‌و پێیان ڕاگەیاند کە

---

٩٥ أبن الاثير: الكامل، مج٧/ ل٢٧٥"البنداري: س.پ، ل٣١٧.

٩٦ العماد الكاتب: البرق الشامي، ج٣/ ل١٤٩" ابو شامة: الروضتين،ج٢/ ل٦" أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل١٧٢.

٩٧ العماد الكاتب: البرق الشامي، ج٣/ ل١٦٢.

٩٨ مرج العيون: شوێنێکە لە کەنارەکانی شام لە باشوری لبنان دا، تاوەکو ئێستا بەناوی (مرجعيون) ماوەتەوە. (ياقوت: س.پ، مج٤/ ل٢٤٤).

٩٩ النويري: س.پ،ج٢٨/ ل٣٩٤" عاشور: الحركة الصليبية، ج٢/ ل٧٦١.

١٠٠ تل القاضي: شوێنێکە دەڕوانێتە سەر ناوچەیەك لە دەوروبەری باکوری (بانیاس) نزیك ڕووباری (دان). (العماد الكاتب: البرق الشامي، ج٣/ ل١٥٨ پەراوێزی ٢).

تێبینی جموجۆڵی خاچ دروشمەکان دەکەن لە دەوروبەری سەربازگەکەی[١٠١]، سوڵتان لەو هەواڵە سەری سوڕماو پێی وتن: "ئەگەر خاچ دروشمەکان مەبەستێکیان هەبێت، سیخوڕەکان دەهاتن ولە هێزو توانایان ئاگاداریان دەکردینەوە"[١٠٢]. لەهەمان کاتدا سیخوڕێك هات بۆ لای سەلاحەددین لە جموجۆڵی خاچ دروشمەکان ئاگاداری کردەوە، بەمەش سەلاحەددین هێزەکانی کۆکردەوە و بەرەو خاچ دروشمەکان پێشڕەوی کرد و توانی بەسەریاندا سەربکەوێت و زیانێکی زۆری پێ گەیاندن، بەشێوەیەك پادشا (بلدوین) زۆر بە زەحمەت ڕزگاری بوو[١٠٣]. لەکاتێکدا سوپای ئەیوبی سەرقاڵی گەمارۆدانی قەڵای (بیت الاحزان) بوو، ڕاستەوخۆ دوای ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی کە لەشەڕی (مرج العیون)دا بەدەستی هێنا، هەواڵێك گەیشتە سەرکردایەتی ئەیوبی، ئەویش ئەوە بوو کە خاچ دروشمەکان دووبارە هێزەکانیان ڕێکخستۆتەوە، و بەڕێژەیەکی زۆر لە (طبریة) کۆبوونەتەوە، ئامادەن بۆ پێشڕەوی کردن بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی سوپای ئەیوبی و ئامانجی ڕزگارکردنی هاوڕێ گەمارۆدراوەکانی ناوقەڵای ناوبراو، لەوکاتەدا سولتان هانی سەربازەکانیدا بۆ پەلە کردن لە ڕزگارکردنی قەڵاکە[١٠٤].

جەنگی دەروونی هێرشبەر هەوڵدەدات بۆ لە ناوبردنی گیانی بەرەنگاری و ڕووبەڕوو بوونەوە لای دوژمن و هەوڵدان بۆ چاندنی تۆی شکست و تێکشکاندن لە دەروونی بەرامبەردا بەچەندین شێوازی جیاواز

---

١٠١ العماد الکاتب: البرق الشامي، ج٣/ ل١٦٢" ابو شامة: الروضتین، ج٢/ ل١٠-١١.

١٠٢ العماد الکاتب: البرق الشامي، ج٣/ ل١٦٢" ابن شاهنشاه: س.پ، ل١٦.

١٠٣ أبن الاثیر: الکامل، مج٧/ ل٢٧٧" ابو شامة: الروضتین، ج٢/ ل١٠" أبن واصل: س.پ، ج٢/ ل٧٤" أبن راهب: تاریخ ابن راهب، ل٩١" ئەمین: الاستخبارت الایوبیة، ل٢٣٠" رنسیمان: س.پ، ج٢/ ل٦٧٨" عاشور: الحرکة الصلیبیة، ج٢/ ل٧٦١.

١٠٤ ابو شامة: الروضتین، ج٢/ ل١١.

وەك هەڕەشەو دووبەرەکی[١٠٥]، بۆ نمونە سوڵتان سەلاحەددین توانی قەڵای (شەنگار) ڕزگار بکات، پاش گەیشتنی هەواڵی خاڵە لاوازەکانی بەرگری ناوقەڵاکە لەلایەن هەندێ لە کوردە زرزاریەکانەوە[١٠٦]، کەلەناو قەڵاکەدا بوون، ئەوەیان ئاشکرا کردبوو کە هێزی دوژمن لەناو قەڵاکەدا توانای پاراستنی تەنیا یەك سوچی قەڵاکەشیان نیە و لەگەڵ ئەوەشدا خەوتوون، سەلاحەددین دەست پێشخەر بوو لە ناردنی کۆمەڵێك لە سەربازانی بۆ ئەو شوێنە، توانیان سەربازەکانی دوژمن دیل بکەنو (الباشورە)[١٠٧]یش کۆنترۆڵ بکەن، بەو کارەش (شرف الدین هندو) لاواز بوو، ناچار قەڵاکەی تەسلیم بە سوپای ئەیوبی کرد[١٠٨]. ساڵی (٥٧٩ك/١١٨٣ز) لەکاتی شەڕی (بیسان)[١٠٩] زانیاری وردو گرنگ گەیشتە سەرکردایەتی ئەیوبی لەبارەی ژمارەی خاچ دروشمەکانەوە لەگەڵ جۆری چەکەکانیانو سەرکردایەتیان، هەروەها سەلاحەدینیان لەوە ئاگادار کردەوە کە فەرماندەی هێزی خاچ دروشمەکان کوڕی (هنفری)یە، لەگەڵ کۆمەڵێك لەخاچ دروشمەکان[١١٠].

سەلاحەددین بە پشت بەستن بەو سیخوڕانەی کە زانیاری وردو گرنگیان بۆ دەهێنا توانی لە وڵاتی شام پێش ڕزگارکردنی قودس پلانە سەربازییە سەرکەوتووەکانی خۆی داڕێژێت، هاوکات هاوڕێیەتی (ریموند)ی خاوەن

---

١٠٥ الدباغ: المرجع في الحرب النفسية، ل١٨٢.

١٠٦ زرزاریەکان: یەکێکە لە هۆزە کوردیەکان،(المسعودي: التنبیه والاشراف،ل٧٨) هەروەها تیرەیەکە لە تیرەکانی (هەزبانیەکان).( زکي: س.پ، ل١٨٧).

١٠٧ الباشورە: پارچە زەویەکە لەدەرەوەی شورای شار، و شورایەکی تایەبتی بۆ دروست دەکەن لەنێوان ئەو پارچە زەویەو سەنگەرەکە، هاوکات لێیەوە دەردەچێت بۆ دەرەوەی شار. (یاقوت: س.پ، مج١/ ل٢٥٨).

١٠٨ أبن الاثیر: الکامل، مج٧/ ل٣٠٤.

١٠٩ بیسان: شارێکە لە دەشتایەکانی شام نێوان (حۆرانو فەڵەستین). (یاقوت: س.پ، مج١/ ل٤١٤).

١١٠ العماد الکاتب: البرق الشامي، ج٥/ ل١٤٨" ابو شامة: الروضتین، ج٢/ ل٥٠" ابن شاهنشاه: س.پ، ل١٥٢.

(طرابلس)یشی قۆستەوە بۆ ئامانجە دەروونیەکانی بەناردنی سیخوڕو تیپە سەرانسۆکانی بۆ ناو ولآتی (بیت المقدس) لەبەشی (طرابلس)و (طبریە)وە، بۆ ئەوەی ئەم سیخوڕانە زانیاری گرنگ‌و پێویست کۆ بکەنەوە کە لەدواتردا هۆکارو یارمەتی دەرە لە ئاسان کردنی پرۆسەی ڕزگارکردنی (بیت المقدس)دا.[111]

لە جەنگی دەروونی هێرشبەر خۆی بەدوژمن ناناسێنێ و بەچەندین شێوە هێرش دەکات لەڕێگەی پڕوپاگەندەو گومان خستنە دڵیان و قۆستنەوەی هەڵەکان بەمەبەستی ئەوەی هەموو توانایەکی خۆی بخاتە گەڕ بۆ شکست پێهێنانی دوژمن[112]. بۆ نموونە لە (١١ی شەوالی ساڵی ٥٨٦ك/ ١١٩٠ن)دا خاچ دروشمەکان بەمەبەستی هێرش بردنە سەر سەلآحەددین پێشڕەویان کرد، بەلآم کاتێك هەستیان بەزۆری ژمارەو خۆئامادەییان کرد، لەبەجێ هێشتنی سەنگەرەکانیان هەڵەیان کرد، پەشیمان بوونەوە وبەخێرایی گەڕانەوە شوێنی خۆیان، سەلآحەددین ئەم هەلەی قۆستەوەو هێرشی کردە سەریان و هێزەکەی بەم شێوەیە دابەش کرد (الافضل علي والظاهر غازي والظافر خضر) لە ناوەڕاست (دڵ) و (الملك العادل)ی برای لەگەڵ سوپای مصری لای ڕاست و (عماد الدین)ی خاوەنی شەنگارو (تقی الدین عمر) خاوەنی (حماه) و (معزالدین سنجر شاه) خاوەنی (جزیره ابن عمر) لای چەپ، سەلآحەددین خۆی لەسەر تەپۆلکەیەکەوە سەرپەرشتی دەکردن[113].

---

١١١ العماد الكاتب: الفتح القسي، ل٦٧-٦٨" ابو شامة: الروضتين، ج٢/ ل٧٤-٧٥" ابن واصل: س.پ، ج٢/ ل١٨٤-١٨٥.

١١٢ علیوه: استراتیجیة الاعلام العربي، ل١٨٤.

١١٣ ابن الاثیر: الكامل، مج٧/ ل٣٧٧.

